# شورەی موسلمانان

## بە

## زیکرو دوعاکان

## لە قورئان و فەرموودە ڕاستەکان



ویردەکانی بەیانیان و ئێواران

سێیەم چاپ




ن/ سعید بن علی بن وهف القحطانی

# ناسنامەی کتێب


ناوی پەرتوك : شوورەی موسڵمانان بەزیکرو دوعاکان

بابەت : ئایینی

نووسینی: سعید بن علي بن وهف القحطاني

وەرگێران : شوان رابەر

پێداچوونەوەی: زیوەر نەنوەر - بەختیار عبدالرحمن

کۆمپیوتەر: نووسینگەی هیوا

چاپ: سێیەم/ ٢٠١٠

شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر 07504639531

شوێنی بلاوکردنەوە: ( کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی )

لەبەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ١٩٢٢ ) ساڵی ( ٢٠٠٨ ) ی دراوەتێ

# شوورەی موسڵمانان

# بەزیکرو دوعاکان

## لە

### قورئان و فەرمووده راستەکان
### بۆ هەمووکاتو لە هەموو شوێنان


ئا. سعيد بن علي بن وهف القحطاني

و. شوان رابەر


پێداچوونەوە

بەختیار عبدالرحمن

زیوەر نەنوەر


سێیەم چاپ

١٤٣١ ٢٠١٠

# پێشـەکی

سوپاس و ستایشێکی بـێ پایـان بـۆ خـوای تـاك و تـەنیاو کردگــار، لەڕاســتیدا هــەر سوپاســی ئــەو دەکــەین، داوای هاوکاری و کۆمەکی هەر لەو دەکەین، داوای لێخۆشــبوون و لێبوردنیش هەر لەو دەکەین، هەر بەویش خۆمان لەهــەموو کــردەوە بــەدو خوتخوتــە خراپــەکانی دڵ و دەروون و کــردارو ئەندامەکانمان دەپارێزین، بێگومان هەر کەسێك ئەو ڕاســتە ڕێ و ڕێنمای بکات، بەهیچ کەسێکی تر گومڕاو سەرگەردان نابێت، هەر کەسێکیش ئـەو گـومڕاو سـەرگەردانی بکـات، بەهیچ کەسێك ڕێنماو ڕاستە ڕێ نـابێ و هیدایـەت نـادرێ، گەواهی دەدەم خوای کردگار تاك و تەنیایە، جگە لــە (الله) هیچ خوایەکی بەهەق و پەرستراوێکی تر نیە، ئـەو خوایـەی تاك و تەنیایەو هیچ شەریك و هاوبەشێکی نیە لە پەرستن و دروســت کــردن و بەڕێوەبردنــدا، گــەواهی ئــەوەش دەدەم

موحەممەدی کوڕی عبدالله (درودو سەلامی خوای گەورە لەسەر خۆی و خانەوادەی و شوێنکەوتوانی بێ تا ڕۆژی دوایی) بەندەو پێغەمبەری خوای گەورەیە .

لەپاش ئەوە بزانن ئەم پەرتووکە کورتکراوەیەکە لە کتێبی (الذکر والدعاء والعلاج بالرقی في الکتاب والسنة)م کورتکردۆتەوە، سەرەتا بەشی زیکرەکانم بەجۆرێ تیادا کورتکردۆتەوە هەڵگرتنی لە نێو بارو کەل و پەڵو شتومەك هەڵگرتندا سوك و ئاسان بێ، دەقی زیکرەکانم بەشێوەی مەتن کورتکردۆتەوە، لەدەرهێنانی دەقی زیکرەکاندا تەنیا یەك سەرچاوە یا دوو سەرچاوەم بەکار هێناوە بەجۆرێ لەدەقە سەرەکی و بنچینەییکەیدا هەیە، جا ئەوەی دەیەوێ سەبارەت بەسەرچاوەی فەرموودەکان هاوەڵە گێڕەرەوەکە بناسێ و زیاتر لەبارەی دەقە زیاد و تێرو تەسەلەکەو دەرهێنانی شارەزا تر بێ، با بگەڕێتەوە سەر دەقە سەرەکیەکەی خۆی، ئیتر بەناوە

جوانەکانی خوای تاك و تەنیا و بەسیفەتە بەرزو بەڕێزەکانی داوای لێ دەکەم ئەم پەرتووکە بەکارو کردەوەیەکی پاك و دڵسۆز دابنێ بۆ خۆی، بەهۆی ئەوە لەژیان و لەدوای مردنم سوودم پێ بگەیێنێ، سوودیش بەو کەسە بگەیێنێ چاپی دەکا یا دەیخوێنێتەوەو کەلکی لێ وەردەگرێ، یا دەبێتە مایەی بڵاوکردنەوەی، خوای تاك و تەنیا تاکە پاڵپشتی ئیماندارانەو لەسەر ئەوە تواناداره، دروودوسەلامی خوای گەورە لەسەر محمد ﷺ و لەسەر خانەوادەو یاران و شوێن کەوتوانی بێ تا رۆژی دوایی.

دانەر

مانگی سەفەری ١٤٠٩ ك

## بەشی یەکەم

# زیکرەکانی
# شەوانەو رۆژانە
# لەقورئان‌و فەرموودە
# راستەکان

## خێرو پلەو پایەی
## زیکر و یاد کردنی خوای گەورە

خـــوای بـــەرزو بـــالاّ فەرمورویـــەتی: ﴿فَٱذۡكُرُونِیٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِی وَلَا تَكۡفُرُونِ ١٥٢﴾ (البقرة)

**واتە** : ئەگەر ئێوە زیکرو یادم بکـەن، منـیش زیکـرو یـادو باستان دەکەم، هەمیـشە زیکـرو یـادو سـوپاس و ستایـشم بکەن، قەت کوفرانەو سپڵەییم بەرانبەر مەکەن .

وە دەفـــــــەرمووێ: ﴿یَـٰٓأَیُّهَا ٱلَّذِینَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرًا كَثِیرًا ٤١﴾ (الاحزاب)

واتــە: ئــەی ئیمانداریـنــە ئێـوە هەمیــشە بەشــێوەیەکی زۆر زیکرو یادی خوای گەورە بکەن .

وە دەفــەرمووێ: ﴿وَٱلذَّٰكِرِینَ ٱللَّهَ كَثِیرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةً وَأَجۡرًا عَظِیمًا ٣٥﴾ (الاحزاب).

**واته** : بێگومان ئەو پیاو و ئافرەتە ئیماندارانەی کە زۆر زیکرو یادی خوای گەورە دەکەن، هەمیشە زارو دەمیان بە زیکرو یادی خوای گەورە تەڕو پاراوە، خوای گەورە لە دوا ڕۆژدا خێرو پاداشت و لێخۆشبوونێکی زۆر گەورەو فراوانی بۆ ئامادە کردوون .

وە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ (الاعراف).

**واته**: هەمیشە لەناو ناخ و دڵ و دەروونی خۆتدا بەرەبەیانیان و دەمەو ئێواران، بە ئاشکراو بەنهێنی، بەپاڕانەوەو بەکڕوزانەوەو بەترس و بیمەوە زیکرو یادی خوای گەورە بکە، بەبێ ئەوەی دەنگ بەرز بکەیتەوە، قەت لەزیکرو یادی خوا بێ ئاگا مەبە، وەکو ئەو کەسانەی کە لەخوا بێ ئاگان، پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ دەفەرمووێ: (مَثَلُ الَّذي

يَذْكُرُ رَبَّهُ والَّذِي لاَ يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ )[1]

**واته :** نمونەی ئەو کەسەی کە زیکرو یادی خوای خۆی دەکاو نمونەی ئەو کەسەی کە زیکرو یادی خوای خۆی ناکا، وەك نمونەی کەسێکی زیندوو و مردوون، بێگومان ئەو کەسەی کە زیندووە زیان و هۆشی لەبەرەو ئەو کەسەش کە مردووە بێ گیانو، هۆشە، واتە ئەو کەسەی کە زیکرو یادی خوای گەورە دەکا گیانو هۆشی لەبەرەو ئەو کەسەش کە زیکرو یادی خوا ناکا وەك مردوو بێ گیانو هۆشە، هەروەها دەفەرمووێ: (أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ، وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ، وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذَّهَبِ وَالوَرِقِ، وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ

---

(١) البخاري مع الفتح ٢٠٨/١١ ومسلم بلفظ (نمونەی ئەو ماڵەی یادی خودای تێدا دەکرێتو ئەوماڵەی یادی خودای تێدا ناکرێت وەکو دڵێکی زیندوو و دڵێکی مردوو وایە).

وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ ؟ قَالُوا بَلَى قَالَ : (ذِكْرُ اللّٰه تَعَالَى)[1] .

**واته : ئایا هەواڵتان پــێ بــدەم دەربــارەی چــاكترین و پــاك ترینــی كردەوەكانتــان، لەلایــەن پاشــای خۆتــان كــە خــوای گەورەیە، بەرزترین كارو كردەوەن كە لەپلەو پایەكانی ئێــوە، بۆ ئێوە زۆر باشترن لە بەخشینی پارەو پول و زێــرو زیــو، بــۆ ئێوە زۆر لەوە باشترە كە بە دوژمنانتان بگــەن، ئەوســا ئێــوە لەگەردەنی ئەوان بدەن و ئەوانیش لەگــەردەنی ئێــوە بــدەن و یەكتر بكوژن؟، گوتیان بەڵێ، ئەویش فەرمووی : ئــەو كــارو كردەوانە زیكرو یادی خوایە.**

**دیسان پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی** (یقول الله تعالى: انا عند ظن عبدي بي، وانا معه اذا ذكرني، فان ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي، وان ذكرني في ملأ ذكرته في ملأ خير منـــــهم، وان تقرب الي شبرا تقربت اليه ذراعا، وان تقرب الي ذراعا تقربت

---

(١) الترمذي ٥/٤٥٩ وابن ماجة ١٢٤٥/٢ وانظر، صحيح ابن ماجة ٣١٦/٢ وصحيح الترمذي ١٣٩/٣

اليه باعا، وان اتاني يمشي اتيته هرولة)[1] .

**واتــه : خــواى گــەورە دەفــەرمووێ: مــن بــەپێی گومــانی بەندەکەمم بەرانبەر خـۆم، واتــە بەندەکــەم بەرانبــەر بــەمن گومانی چۆن بێ منیش ئاوام، من لەگەڵ بەندەکەمم کاتێك زیکرو یادو باسم دەکات، ئەگەر بەندەکەم لــەدڵ و دەروونــی خۆیــدا زیکــرو باســم بکــا، ئــەوا منــیش لــەدڵ و دەروون و لەلایــەن خۆمــەوە باســی دەکــەم، ئەگــەر لــەلای خــەڵك و لەشوێنێکی بەرزو پلــەو پایــەدار باســم بکــا، ئــەوا منــیش لەشوێنێکی بەرزو پلەو پایەدار تری چاکتر باســی دەکــەم وە ئەگەر هەرکاتێ بەندەکەم تــەنها یــەك بــست لــەمن نزیــك بکەوێتەوە، من یەك گەز لێی نزیك دەکەومەوە، ئەگەر یــەك گەز لێم نزیك بکەوێتەوە، ئەوا منیش یەك قۆڵ و بــاڵ لێــی نزیــك دەبمــەوە ئەگــەر بەرۆیــشتن بــەرەو مــن بــێ، منــیش بەخۆشرۆیی بەرەو ئەو دەچم،** (عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ

---

(١) البخاري (٨/ ١٧١) ومسلم٤/٢٠٦١ واللفظ للبخاري.

رَجُلاً قَالَ : يَا رَسُولَ اللهِ إنَّ شَرَائِعِ الإسْلاَمِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَــيَّ فَأَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ .قَالَ (لاَ يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْباً مِنْ ذِكْرِ اللهِ) [1].

**واته:** له عبدالله ی کوڕی بوسر دەگێڕنەوە کـە پیاوێـك بـە پێغەمبەری ﷺ گوت، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاسـتی ئەرك و واجباتـەکانی ئیـسلام لـە سـەر مـن زۆر قـورس و زۆربوونە، جا شتێکم پێ نیشان بدە کـە پـەنای بـۆ ببـەم و دەستی پێ بگرم بۆ ئەوەی لە دوا ڕۆژدا بەسـم بـێ و ڕزگـارم بکات، ئەویش لە وەڵامیدا فـەرمووی : بـا هەمیـشە دەم و زمانت بەزیکرو یادی خـوا تـەڕو پـاراوو بـەردەوام بێـت، وە فەرموویەتی : (مَنْ قَرَأَ حَرْفاً مِنْ كِتَابِ اللهِ فَلَهُ بِـهِ حَـسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لاَ أَقُولُ : (لم *)، حَرْفٌ، وَلَكِنْ : أَلِفٌ حَرْفٌ، وَلاَمٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ)[2].

---

(١) الترمذي ٥/٤٥٨ وابن ماجة ٢/١٢٤٦ وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٣٩ وصحيح ابن ماجة ٢/٣١٧ .

(٢) الترمذي ٥/١٧٥ وانظر، صحيح الترمذي ٣/٩ وصحيح الجامع الصغير ٥/٣٤٠.

واتە: هەر کەسێکی ئیماندار تەنها یەك پیت لەپەرتووکی خوای گەورە بخوێنێ کە قورئانی پیرۆزە، ئەوا بەهۆی ئەوەوە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ کە ئەو چاکەیەش بەقەد دە چاکەی وەکو خۆیەتی، نالێم وشەی (الم) لە قورئاندا تەنها یەك پیتە، بەڵکو ئەلف بەتەنها پیتێکەو لامیش پیتێکەو میمیش پیتێکە، واتە تەنها ئەم وشەیە (٣٠) خێرو چاکە دەکات، وَعَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ : خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَنَحْنُ فِي الصُّفَّةِ فَقَالَ : (أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ كُلَّ يَوْمٍ إِلَى بُطْحَانَ أَوْ إِلَى الْعَقِيقِ فَيَأْتِيَ مِنْهُ بِنَاقَتَيْنِ كَوْمَاوَيْنِ فِي غَيْرِ إِثْمٍ وَلاَ قَطِيعَةِ رَحِمٍ ؟ فَقُلْنَا : يَا رَسُولَ اللهِ نُحِبُّ ذَلِكَ.

قَالَ : (أَفَلاَ يَغْدُو أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَيَعْلَمَ، أَوْ يَقْرَأَ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ خَيْرٌ لَهُ مِنْ نَاقَتَيْنِ، وَثَلاَثٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثٍ، وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَرْبَعٍ، وَمِنْ أَعْدَادِهِنَّ مِنَ الإِبِلِ)[١]

واتە : لەعوقبەی کوڕی عامرەوە دەگێڕنەوە، گوتی : ئێمە

(١) مسلم ١/٥٥٢ .

لـه (صـوفه) بـوورین کـاتیّ کـه پیّغهمبـهر ﷺ دهرچـوو، فهرمووی : ئایا کیّ لهئیّوه حهز دهکا ههموو ڕۆژیّ بـهیانیان بچیّته بوتحان یا بچیّته عهقیق، لهویّ بهبیّ تاوان و دابڕان له ناسیاوانی دوو وشتری کۆپاره بهرزی چاك بیّنیّتهوه، گوتمـان : ئهی پیّغهمبهری خوا ئیّمه ئهوهمان پیّ خۆشه، پیّغهمبهریش ﷺ فهرمووی : ئهی ههر یهکیّك له ئیّوه بـهیانیان ناچـیّته مزگـهوت، بـۆ ئـهوهی شـتیّك فیّـر ببـیّ یـا دوو ئایـهت لهپهرتووکی خوای گهوره بخویّنیّ، ئهوه لـه دوو وشـترهکه بـۆ ئهو باشتره، وه خویّندنی سیّ ئایهتی بۆ له سیّ وشتر باشـتره، هی چوار ئایـهتی بـۆ لهچـوار وشـتر باشـتره، بـهڵکو بـۆی لهچهندان وشتر باشتره، ئیتر بهم شیّوه چهند ئایهت فیّر بـیّ و بخویّنیّ و کاری پیّ بکا بۆی له ههنده وشتر باشتره .

وه فهرموویهتی (مَنْ قَعَدَ مَقْعَداً لَمْ يَذْكُرِ اللهَ فِيهِ كَانَتْ عَلَيْـهِ مِنَ اللهِ تِرَةٌ، وَمَنِ اضْطَجَعَ مَضْجَعاً لَمْ يَذْكُرِ اللهَ فِيهِ كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللهِ تِرَةٌ)[1].

---

(١) أبو داود ٢٦٤/٤ و غيره. وانظر، صحيح الجامع ٣٤٢/٥ .

**واتە** : هەر کەسێك لەهەر جێگایەك دابنیشێ و تیایدا زیکرو یادی خوا لەوێ نەکا، ئەوا لەلایەن خوای گەورە تاوان و بارگرانیەکی لەسەرە، هەرکەسێك لەهەر جێگایەك پاڵبداتەوەو زیکرو یادی خوای گەورەی تیادا نەکا، ئەوا لەلایەن خوای گەورە لەسەری دەبێتە تاوان و بارگرانی .

وە دەفەرمووێ:: (مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِساً لَمْ يَذْكُرُوا اللّٰهَ فِيهِ، وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِمْ إِلاَّ كَانَ عَلَيْهِمْ تِرَةً، فَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ)[1] .

**واتە**: هەر کۆمەڵەکەسێك لەهەر کۆڕو دانیشتگەیەك دابنیشێ، زیکرو یادی خوای گەورەی تیادا نەکەو درودو صەلاوات لەسەر پێغەمبەرەکەیان لێ نەدەن، ئەوا لەلایەن خوای گەورە تاوان و بارگرانیەکیان لەسەر دەبێت، جا ئەگەر خوا حەز بکا ئەوا سزاو ئازاریان دەدا، ئەگەر حەزیش بکا ئەوا لێیان خۆش دەبێ و عافویان دەکا .

---

(١) الترمذي وانظر، صحيح الترمذي ٣/ ١٤٠ .

**وە دەفەرمووێ:** (مَا مِنْ قَوْمٍ يَقُومُونَ مِنْ مَجْلِسٍ لاَ يَذْكُرُونَ اللهَ فِيهِ إِلاَّ قَامُوا عَنْ مِثْلِ جِيفَةِ حِمَارٍ وَكَانَ لَهُمْ حَسْرَةً)[1] .

**واتە : هەر گەل و کۆمەڵێك لە کۆڕو دانیشتنێك هەستن و تیادا باسی خوای گەورە نەکەن، وەکو ئەوە وایە کەلەسەر کەلاکەکەر هەستن، کە بۆیان دەبێتە داخو کەسەرو حەسرەت و پەژارەو پەشیمان دەبنەوە .**

## ١- زیکرەکانی لەخەو هەستان

١/١- (الْحَمْدُ لله الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيهِ النُّشُورُ)[2]،

**واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئێمەی زیندوو کردەوە، دوای ئەوەی ئێمەی مراند، گەڕانەوەو زیندوو بوونەوەشمان هەر بۆ لای ئەوە .**

٢/٢- (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ،

---

(١) أبو داود ٢٦٤/٤ و أحمد ٣٨٩/٢، وانظر: صحيح الجامع ١٧٦/٥ .

(٢) البخاري مع الفتح ١١٣/١١ ومسلم ٢٠٨٣/٤ .

وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ، رَبِّ اغْفِرْ لِي)[١]،

**واتە : هیچ خواو پەرستراوێکی بەحەق و شایستە نیە، جگە لەو خوایەی کە ناوی (الله)یەو خوایەکی تاك و تەنیایە، هیچ شەریك و هاوبەشی نیە.**

**لەخوایەتیو پەرستندا، هەموو سوپاس و ستایش و موڵك و تواناو دەسەڵاتێك هەر بۆ ئەوە، ئەم خوایە لەسەر هەموو شتێك تواناداروو بەهێزە، پاکی و بێ گەردی و بێ خەوشی بۆ ئەو خوایە، هیچ خوایەکی بەهەق نیە تەنها (الله) نەبێ، ئەو خوایە لەهەموو شتێك گەورەترە کەهەیەو بەبیر ئینسان دادێ، هیچ تواناو هێزێکیش نیە تەنها بەخوای گەورەو بالاّ**

---

(١) واتە: (هەر کەسێك ئەمە بڵێ لەگوناهەکانی دەبووردرێ، ئەگەر دوعای پێ بکات وەڵامی دەدرێتەوە، ئەگەریش هەڵستێ دەست نوێژ بشۆرێو نوێژ بکات ئەوا نوێژەکەی لێ قەبوڵ دەکرێ). البخاری مع الفتح (وغیره واللفظ لا بن ماجه، انظر، صحیح ابن ماجه ٢/٣٣٥).

دەست نەبێ، ئەی خوای پەروەردگار لێم خۆش بەر لەگوناه و تاوانەکانم ببورە .

٣/٣-(الْحَمْدُ لله الَّذي عَافَانِي، فِي جَسَدِي، وَرَدَّ عَلَيَّ رُوحِي، وَأَذِنَ لِي بِذِكْرِهِ)[١] .

**واتە :** سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە منی لە ڕووی لاشەوە ساغ و سەلامەت و پارێزراو کردوە، رۆحی منی گێڕایەوە جەستەم، منی دایەوە، مۆڵەتی منی دا بۆ ئەوەی زیکرو یادو سوپاس و ستایشی ئەو بکەم.

٤/٤- ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأَيَـٰتٍ لِّأُوْلِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا

(١) الترمذی ٤٧٣/٥ وانظر، صحيح الترمذی ١٤٤/٣.

سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدۡخِلِ
ٱلنَّارَ فَقَدۡ أَخۡزَيۡتَهُۥۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ﴿١٩٢﴾
رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ
بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا
سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا
عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ
ٱلۡمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ
عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ
فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي
وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ
جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ

عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾ ﴾

(سورة ال عمران ١٩٠-٢٠٠) .

**<u>واته :</u>** بەڕاستی لەدروستکردنی ئەرزو ئاسمانەکان و لە

گۆڕان و جیاوازی شەو و ڕۆژدا کۆمەلێك بەڵگەو نیشانەی زۆر گەورەو بەپیزو سەرنج ڕاکێشەر هەن بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن ئەقڵن و تێ دەگەن، ئەوانەی کە هەمیشە بەپێوەو بەدانیشتنەوەو بە ڕاکشان و بە پاڵدانەوەو لەسەر کەلەك و تەنیشتەکانیانەوە زیکرو یادی خوای گەورە دەکەن، بیر لەچۆنیەتی و گەورەیی دروستکردنی ئەرزو ئاسمانەکان دەکەنەوە، دەرەنجام دەڵێن : ئەی پەروەردگار بەڕاستی تۆ ئەم ئەرزو ئاسمان و بونەوەرەت بەهەوەنتەو بەبێ هودە دروست نەکردووە، کەواتە دە پاکی و بێ گەردی و بێ نەنگی بۆتۆی پەروەردگاری دروست کەر، لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە، ئەی پەروەردگارا بەڕاستی هەر کەسێك کە تۆ بیخەیتە نێو ئاوری دۆزەخ، ئەو کەسەت سەر شۆڕو سوك و ڕیسواو خەجاڵەتبار کردووە، ئەو ڕۆژەش ستەمکاران هیچ هاوکارو پشت و پەنایەکیان نیە هاوکاریان بکات و سەریان بخات، ئەی پەروەردگارا بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگکەرێ بوو کە بۆ بڕوا هێنان بانگی دەکرد تا بڕوا بە پەروەردگارەکەیان بێنن،

ئەوسا ئێمەش ئیمانمان پێ هێنا، ئەی پەروەردگارا دە لە گوناه و تاوانەکانمان خۆش ببە، گوناه و تاوان و خراپەکانمان لێ بسڕەوەو لێ داپۆشە، لەگەڵ چاکە کاراندا بمان مرێنە، ئەی پەروەردگارا لەدوای مردن ئەوەمان پێ ببەخشە کە بەڵێنت پێ داوین لەسەر زاری پێغەمبەرانت، لەڕۆژی دوایی دا سەر شۆڕو ڕیسوامان مەکە، بێگومان تۆ سەرپێچی وەعدو بەڵێنەکانت ناکەی، ئەوسا خوای گەورە نزاو پاڕانەوەکانی گیرا کردن و پێی فەرموون: بێگومان کارو کردەوەی هیچ کەسێك لە ئێوە لە نێرو لە مێ کە هەندێکتان لە هەندێکتان بوون بەزایە نادەم، جا ئەو کەسانەی لە پێناو من کۆچیان کردووە، لەماڵ و حاڵی خۆیان بەدەرنراون، ئێش و ئازارو ئەشکەنجە دراون، لەپێناو خوادا جەنگیان کردووەو کوژراون، بەڕاستی لەبری ئەوە کارو کردەوە بەدوخراپەکانیان دادەپۆشم و لێیان دەسڕمەوە، دەیانخەمە نێو بەهەشتێك کە چەندان جۆو ڕووبار بە ژێریاندا دەڕوا، ئەوەش وەکو خێرو پاداشتێکە لەبری ئەوە لەلایەن خوای گەورەوە پێیان

دەدرێتەوە، خوای گەورە لەوەش زیاتر باشترین خێرو پاداشتی لەلایە بۆ چاکەکاران، ئەی موحەمەد ﷺ ئاگادار بە هاتوچۆو خۆشی و گۆڕانکاری ئەو بێ باوەڕانەی کە لە ولاّتدان لەخشتەت نەبا، هەڵتنەخەڵەتێنێ، ئەمە تام و چێژو خۆشیەکی زۆر کورت و کەمە، لەپاش ئەوە تاکە جێیان، ئاو ئاوری دۆزەخە، کە خراپترین جێ و لانکەی ژیانە، بەلاّم ئەو کەسانەی کە لەپەروەردگاریان دەترسن بەهەشتیان بۆ هەیە کەچەندان جۆگەو ڕوباری سازگارو زولالی بەژێر دادێ، لەنێو ئەم بەهەشتانە بە هەمیشەیی دەمێننەوەو گوزەر دەکەن کە لەلایەن خوای کردگارەوە بۆیان ئامادەو سازکراوە وەکو ڕێزو پاداشتێك، ئەوەی لەلای خوایە بۆ چاکەکاران زۆر باشترە لەوەی کەتەنها پێیان دەدرێت، بێگومان هەندێك کەس لەنێو خاوەن پەرتووك و نامەدارەکاندا هەیە کە بڕوای بەخواو بەپەیامەکە بۆ ئێوەو بۆ سەر خۆیان دابەزیوە، بەرامبەر بە خوای کردگار ملکەچن، ئایەتەکانی خوای گەورە بەبڕە پارەیەکی کەم نافرۆشن، کەواتە ئەم خاوەن

پەیامانە لەڕۆژی دواییدا لەلایەن پەروەردگاریانەوە خێرو پاداشتێکی زۆرو زەوەندیان بۆ هەیە، بەڕاستی خوای گەورە لێپرسینەوەی زۆر خێرایە، ئەی بڕوادارینە هەمیشە خۆ ڕاگربن، لەخۆڕاگری دوژمن خۆڕاگرتر بن، سەنگەرگرو ئێشکگر بن، لەخوا بترسن و بەگوێی خوا بکەن، بەڵکو لە ڕۆژی دواییدا سەرکەوتوو سەرفرازو ڕزگار بن .

## ٢- دوعای جل و بەرگ لەبەرکردن

٥- (الْحَمْدُ للهِ الّذي كَسَانِي هَذَا (الثّوبَ) وَرَزَقَنيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ)[١].

**واتە:** سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بەم بەرگ و پۆشاکە دایپۆشیم، بەبێ هەوڵ و ماندو بوون و توانای هێزی خۆم ئەم بەرگ و پۆشاکەی پێدام .

---

(١) أخرجه أهل السنن إلا النسائي انظر، إرواء الغليل ٤٧/٧ .

## ٣- دوعای جل و بەرگی نویٚ لەبەرکردن

٦-(اللهمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنيه، أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِه وَخَيْرِ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُبِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَه)[١] .

**واتە** : ئەی خوایە سوپاس و ستایشێکی بیٚ پایان بۆ تۆ، کە ئەم جل و بەرگەت بەمن داوە، بەم جل و بەرگە منت داپۆشی، داوای خێرو چاکەی ئەم جل و بەرگەت لیٚ دەکەم، وەداوای ئەو خێرو چاکەیەت لیٚ دەکەم کە بۆی دروست کراوە، وە خۆم دەپارێزم بە تۆ لەخراپەی ئەوەی کە ئەم جل و بەرگەی بۆ دروست کراوە .

## ٤- دوعا بۆ ئەو کەسەی جل و بەرگی نویٚ لەبەر دەکات

١/٧- (تُبْلِي وَيُخْلِفُ اللّٰهُ تَعالَى)[٢] .

**واتە** : یا خوا ئەم جل و بەرگە بڕزیٚ و لەناو بچیٚ و خـوای

(١) أبو داود والترمذي والبغوي وانظر، مختصر شمائل الترمذي للألباني ص ٤٧ .

(٢) أخرجه أبو داود ٤١/٤، وانظر، صحيح أبي داود ٢/٧٦٠ .

گەورەش هی تری لەدوا جێبێڵێ و ببەخشێ .

٢/٨- (الْبسْ جَديداً، وَعِشْ حَميداً، وَمُتْ شَهيداً)[١]، واتــه : جل و بەرگی تازە بپۆشە، بەخێرو خۆشی و سوپاس گوزاریەوە بژی، بە شەهیدی بمری.

## ٥- ئەوەی کە لەکاتی دانانی جلەکان دەوترێت

٩-﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ﴾[٢]

واتــه : بەناوی خوا.

## ٦- دوعای پێش چوونە ئاودەست

١٠- (بِسْمِ اللهِ) اَللُّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُبِكَ مِنَ الْخُبْثِ وَالْخَبَائِثِ)[٣] .

واتــه : بەناوی خوای تاك و تەنیا، ئـەی خوایـە خـۆم بـەتۆ

(١) ابن ماجه ٢/١١٧٨ والبغوى ١٢/٤١ وانظر، صحيح ابن ماجه ٢/٢٧٥ .

(٢)الترمذي ٢/٥٠٥ وغيره،وانظر، الارواء برقم ٤٩ وصحيح الجامع ٣/٢٠٣.
ابو داود وابن ماجة واحمد وانظر، ارواء الخليل ١/١٢٢

(٣) أخرجه البخاري ١/٤٥ ومسلم ١/٢٨٣ وزيادة بسم الله في أوله أخرجها سعيد بن منصور انظر، فتح الباري ١/٢٤٤ .

لەشەيتانی نێرو مێ و لەهەموو جۆرە پیسیەکی دڵ و دەروون و کرداری دەپارێزم .

## ٧- دوعای دوای دەرچوون لە ئاودەست

١١-(غُفْرَانَكَ)[١].

**واتە** : ئەی پەروەردگارا داوای لێخۆشبوون هەر لەتۆ دەکەین .

## ٨- زیکر کردنی پێش دەست نوێژ هەڵگرتن

١٢- ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ﴾[٢] .

**واتە** : بەناوی خوا.

---

(١) أخرجه أصحاب السنن إلا النسائي، أخرجه في عمل اليوم والليلة انظر،. تخريج زاد المعاد ٢/٣٨٧ .

(٢) ابو داود وابن ماجه واحمد وانظر، ارواء الخليل ١/١٢٢.

## ٩- زیکری دوای دەست نوێژ هەلگرتن

١/١٣- (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَه إِلاَّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ . . . . . .)[١] .

**واتە : گەواهی دەدەم هیچ خوایەکی بەهەق نیە جگە لە (الله) نەبێ، خوایەکی تاك و تەنیایە، هیچ شەریك و هاوبەشێکی نیە لە پەرستنیدا، گەواهی دەدەم محمد ﷺ بەندەو پێغەمبەری خوای گەورەیە .**

٢/١٤- (أَللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ)[٢] .

**واتە : ئەی خوای گەورە، بمکە بە یەکێك لە تۆبەکاران و یەکێك لە پاکژکراوان، وەك ئەوانەی کە تۆبەکارو پاك و خاوێن و بێ گوناه و تاوانن .**

٣/١٥ (سُبْحَانَكَ اللهمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ،

---

١مسلم ٢٠٩/١

( ٢) الترمذی ٧٨/١ وانظر، صحیح الترمذي ١٨/١.

أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)[1].

**واتە :** پاكی و بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگار، داوای لێخۆشبوون هەر لەتۆ دەكەم، هەر بۆلای تۆش دەگەڕێمەوەو پەشیمان دەبمەوە .

## ١٠- زیكری لەماڵ دەرچوون.

١٦/١- (بِسْمِ اللهِ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ)[2]،

**واتە :** بەناوی خوای تاك و تەنیا، پشت و پەنام هەر خوایە، هیچ تواناو هێزێك نیە تەنیا بەخوا نەبێ .

١٧/٢- (اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُبِكَ أَنْ أَضِلَّ، أَوْ أُضَلَّ، أَوْ أَزِلَّ،او

---

(١) النسائي في عمل اليوم والليلة ص١٧٣ وانظر، إرواء الغليل ١٣٥/١ و ٩٤/٢ .

(٢) أبو داود ٣٢٥/٤ والترمذي ٤٩٠/٥ وانظر، صحيح الترمذي ١٥١/٣ .

أُزَلَّ، أَوْ أَظْلِمَ، أَوْ أُظْلَمَ، أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ)[1].

**واتــه : خوایــه خــۆم بــه تــۆ لــهوه دهپــارێزم کــه گــومڕاو ســهرگهردان بم، یــا کــهس گــومڕاو ســهرگهردان بکــهم، یــا ههڵخلیــسکێم و لاڕێ بم، یــا کــهس ههڵخلیــسکێنم و لاڕێ بکهم، خۆم دهپارێزم که ستهمم لێ بکرێ، یا ســتهم لهکــهس بکهم، خۆم دهپارێزم بهتۆ نهفامی بکهم، یانــهفامیم لهگــهڵ بکرێت.**

## ١١- زیکری چوونه ژوورهوهی ماڵ

١٨- (بِسْمِ اللهِ وَلَجْنَا، وَبِسْمِ اللهِ خَرَجْنَــا، وَعَلَــى اللهِ رَبِّنَــا تَوَكَّلْنَا، ثُمَّ لِيُسَلِّمْ عَلَى أَهْلِهِ)[2].

---

(١) أهل السنن وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٥٢ وصحيح ابن ماجه ٢/٣٣٦ .

(٢) أخرجه أبو داود ٤/٣٢٥، وحسن إسناده العلامة ابن باز في تحفة الأخيــار ص ٢٨، وفي الصحيح (ئهگهر کهسێك چووه ماڵهکـهی خـۆیو لــهکاتی چــوونه ژوورهوهو لهکاتی نان خواردنیدا یادی خوای کرد، ئهوا شهیتانی گهوره بــه شهیتانهکانی دیکه دهڵێ نهجێی مانهوهی شهوتان لێره ههیــه نــهخۆراكو خواردنیش) مسلم برقم ٢٠١٨ .

**واتە :** بەناوی ئەو خوایە، چووینە ژوورەوەی ماڵەوە، بەناوی ئەو خوایە لەماڵەوە دەرچووین، پشت و پەنامان هەر خوای پەروەردگارمانە، پاشان با سەلام لەماڵ و خێزانی بکات .

## ١٢- دوعای چوونە مزگەوت

١٩- اللهمَّ اجْعَلْ فِي قَلبِي نُوراً، وَفِي لِسَانِي نوراً، وَفِي سَمْعِي نُوراً، وَفِي بَصَرِي نُوراً، وَمِنْ فَوْقِي نُوراً، وَمِنْ تَحْتِيَ نوراً، وَعَنْ يَمِينِي نُوراً، وَعَنْ شِمالِي نُوراً، وَمِنْ أَمَامِي نُوراً، وَمِنْ خلْفِي نُوراً، وَاجْعَلْ فِي نَفْسِي نُوراً، وأَعْظِمْ لِي نُوراً، وَعَظِّمْ لِي نُوراً، واجْعَلْ لِي نُوراً،، وَاجْعَلنِي نُوراً، اللهمَّ أعْطِنِي نُوراً، .واجْعَلْ فِي عَصَبِي نُوراً، وفي لَحْمِي نُوراً، وَفِي دَمِي نُوراً، وفي شَعرِي نُوراً، وَفِي بَشَرِي نُوراً) (١) . (اللهمَّ اجْعَلْ لِي نُوراً، فِي قَبْرِي .

---

(١) جميع هذه الخصال في البخاري ١١/١١٦ برقم ٦٣١٦ ومسلم ١/٥٢٦، ٥٢٩، ٥٣٠، برقم ٧٦٣ .

. . وَنُوراً فِي عظامي، وَزِدْنِي نُوراً)ثلاث مرات[1]، (وَهَبْ لِي نُوراً عَلَى نُورٍ)[2]،

**واتە : ئەی خوای گەورە نورو ڕوناکیەکم لە ناو دڵ و دەروون و زمان و گوێ و چاور لەسەرەوەم و لە ژێرەوەم و لە ڕاست و لەچەپم و لە پێشەوەو لەدواوەم دابنێ، نورێکم بۆ گەورەو گوشادودرەخشان بکە، نورێکم بۆ سازو ئامادەبکە، بمکە بە نورو ڕوناکی، خوایە نورێکم پێ ببەخشە، بمکە بەنور، نورێکم پێببەخشە، خوایە نورێك لەنێو ڕەگ و دەمارو خوێن و گۆشت و لەنێو پێست و مۆخ و مووەکانم دابنێ، خوایە نورێکم بۆ لەنێو گۆڕو ئێسقانەکانم دابنێی و گۆڕم ڕووناك بکەوە، خوایە نورێکم بۆ زێدەو زەوەند بکە، خوایە نورێکم بۆ زێدەو زەوەند بکە، خوایە نور لەدوای نورم پێ ببەخشە.**

---

(١) الترمذي برقم ٣٤١٩، ٥/٤٨٣ .

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد برقم ٦٩٥، ص٢٥٨ وصحح إسناده الألباني في صحيح الأدب المفرد برقم ٥٣٦.

ذكره ابن حجر في فتح الباري وعزاه إلى ابن أبي عاصم في كتاب الدعاء، انظر، الفتح ١١/١١٨ وتي: بەهۆی جیاوازیو زۆری گەیشتە بیستو پێنج دوعا.

## ١٣- دوعای چوونه نێو مزگەوت

٢٠- (أَعُوذُ بِاللهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)[١]، (بِسْمِ اللهِ، وَالصلاةُ)[٢]، (والسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللهِ)[٣]، (اللهمَّ افْتَحْ لِي أَبْوابَ رَحْمَتِكَ)[٤] .

**واتە : خۆم بەخوای گەورەو بەڕووی پاك و بەڕێزی و بەدەسەلاَتدارێتی كۆنی لەشەیتانی دوورخراوەو نەفرەت لێكراو دەپارێزم، بەناوی خوای تاك و تەنیا، درودو سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، خوایە دەرگاكانی ڕەحمەتی خۆتم لێ بكەرەوەو لێم والآ بكە .**

---

(١) أبو داود وانظر، صحيح الجامع برقم ٤٥٩١ .

(٢) رواه ابن السني برقم ٨٨ وحسنة الألباني .

(٣) أبو داود ١/١٢٦ وانظر، صحيح الجامع ١/٥٢٨.

(٤) مسلم ١/٤٩٤، وفي سنن ابن ماجه من حديث فاطمة (خودایە لێم ببورەو دەرگاكانی رەحمەتی خۆتم بۆ بكەوە) وصححة الألباني لشواهده انظر، صحيح ابن ماجه ١/١٢٨-١٢٩ .

## ١٤- دوعاى دەرچوون لەمزگەوت

٢١- (بِأسْمِ اللهِ وَالصَّلاَةُ والسَّلاَمُ عَلَى رَسُولِ اللهِ، اللهمَّ إنِّي أسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ، اللهمَّ اعْصِمْنِي مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ)[١].

**واتە : بەناوى خواى تاك و تەنيا، درودو سەلامى خواى گەورە لەسەر پێغەمبەرى خوا ﷺ بێت، خوايە داواى خێرو چاكەو بەخشش لەتۆ دەكەم، خوايە لەشەيتانى دوورخراوەو نەفرەت لێكراوم بپارێزە .**

## ١٥- زيكرەكانى كاتى بانگدان

١/٢٢- يَقُولُ مِثْلَ يَقولُ الْمُؤَذِّنُ إلاَّ فِي (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ وَحَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ) فيَقُولُ : (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ)[٢].

---

(١) انظر، تخريج روايات الحديث السابق رقم (٢٠) زيادەكە(خوايە لەشەيتانى دوورخراودو نەفرەت لێكراو بپارێزە) ابن ماجە، انظر، صحيح ابن ماجە ١٢٩/١.

(٢) البخاري ١٥٢/١ ومسلم ٢٨٨/١ .

**واتە :** ئەو کەسەی کە وەڵامی بانگدان دەداتەوە، دەبێ لەهەمووی وەکو بانگدەر بڵێ، تەنها لە (حي على الصلاة، حي على الفلاح)نەبێ، لەوێ دەڵێ (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ).

**واتە :** هیچ تواناو هێزێك نیە تەنها بەهۆی خواوە نەبێ .

٢/٢٣- يَقُولُ (وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لا إلاَ إِلَهَ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدٍ عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً، وَبِمُحَمَّداً رَسولاً، وَبالإِسْلاَمِ ديناً) [1]، يَقولُ ذلِكَ عَقِبَ تَشَهُّدِ الْمُؤَذِّنِ) [2] .

**واتە : لەکاتی کە بانگکدەر لەبانگداندا دەڵێ** (أَشْهَدُ أَنْ لا إلاَ إِلَهَ اللهِ، وَأَشْهَدُ أَنَّ محمد رَسُول الله) **دەبێ گوێگر لەوێ لەوەڵامدا بڵێ :** (وأنا أشهد أن لا اله الا اللهُ وَحْدَهُ لا شريك له، و أن محمداً عبدهُ ورسولهُ، رضيت بالله رباً وبمحمد رسولاً ﷺ وبالاسلام ديناً).

---

(١) مسلم ١/٢٩٠ .

(٢) ابن خزيمة ١/٢٢٠ .

**واته** : **منیش گەواهی ئەوە دەدەم کە جگـە لـە (الله) هـیچ خوایـەکی تـر نیـە ، گـەواهی دەدەم کـە محمـد ﷺ بەنـدەو پێغەمبەری خوایە ، رازیم (الله) پەروەردگارم بێ‌و بێ رازیشم محمد (ص) پێغەمبـەرم بـێ‌و هـەروەها رازی بـووم ئیـسلام ئایینی ژیانم بێ.**

**٣/٢٤**- (يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بَعْـدَ فَرَاغِـهِ مِـنْ إِجَابَـةِ الْمُؤَذِّنِ)[١] **پێویستە گوێگر دوای ئەوەی کە لەوەڵامدانەوەی بانگدەر دەبێتەوە ، صەلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ لێبدات .**

**٤/٢٥**- يَقُولُ ﴿اللهمَّ رَبَّ هذه الدَّعْوَةِ التَّامَّـةِ ـــ وَالـصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ، آت مُحَمَّداً الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُـوداً الَّذِي وَعَدتَهُ، (إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ المِيعَادَ) ﴾[٢] **کاتێك کە بانگـدەر لەخۆبووەوە ، دەبێ گوێگر بڵێ ئەی خوایە پـەروەردگاری ئـەو دەعوەتە تێرو تەواوە ،ئەم نوێژە ڕاگرو بەرپایـە ، پلـەو پایـەی**

---

( ١) مـسلم ١/٢٨٨

(٢) البخاري ١/١٥٢ وما بين المعكوفين للبيهقي ١/٤١٠ وحسن إسناده العلامة عبدالعزيز بن باز فى تحفة الأخيارص ٣٨.

خێرو چاکەی (وەسیلە) بدە بە محمد ﷺ، بینێرە ئەو جێگەو پلەو پایە پیرۆزو سوپاسکراوەی بەڵێنت پێداوە، بێگومان تۆ سەرپێچی و پێچەوانەی ئەو وەعدەو بەڵێنە ناکەی کە پێتداوە .

٢٦/٥- (يَدْعُو لِنَفْسِهِ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ فَإِنَّ الدُّعَاءَ حِينَئِذٍ لاَ يُرَدُّ)[1] ، ئەوسا گوێگر لەنێوان کاتی بانگ و قامەتکردن بۆ نوێژ، دوعاو پاڕانەوە لەخوای گەورە بۆ خۆی و خانەوادەکەی دەکا، چونکە ئەوکاتە دوعا لەلایەن خوای گەورە گیرا دەبێ و ڕەت ناکرێتەوە .

## ١٦- دوعای دەست بەنوێژ کردن

١/٢٧- (اللهمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللهمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ، كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، أَللهمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ، بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ

(١) الترمذي وأبو داود أحمد وانظر، إرواء الغليل ٢٦٢/١ .

وَالبَرَدِ)[1] .

**واته :** خوایە نێوانی من و هەڵەو تاوانەکانم دوورو بەرین بکە، هەروەکو نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوورو فراوان کردووە، خوایە لەهەڵەو تاوانەکانم پاکم بکەوە، هەروەك جل و بەرگی سپی بە ئاو لە چلك و پیسی پاکژ دەبێتەوە، خوایە بە بەفرو بەئاوو بە تەرزە باران لەگوناه و تاوانەکانم بشۆرو پاکم بکەوە .

٢/٢٨- (سُبْحَانَكَ اللهمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ)[2] .

**واته :** پاکی و بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگارا، بە سوپاس و ستایشتەوە بەناوی بەرزو بڵندو پاکو پیرۆزتەوە، بە بەرزی و دەوڵەمەندی و بێنیازیتەوە، جگە لە تۆ هیچ خوایەکی تر نیە .

---

(١) البخاري ١/١٨١ ومسلم ١/٤١٩ .

(٢) أخرجه أصحاب السنن الأربعة، وانظر، صحيح الترمذي ١/٧٧ وصحيح ابن ماجه ١/١٣٥.

٣/٢٩- (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذي فَطَرَ السَّمَوات وَالأَرْضَ حَنيفاً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكينَ، إِنَّ صَلاَتِي، وَنُسُكِي، وَمَحْيَايَ، وَمَمَاتِي لله رَبِّ الْعَالَمينَ، لا شَريكَ لَهُ وَبِذلكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلمِيْنَ، اللهمَّ أَنتَ الْمَلكُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ . أَنْتَ رَبِّ وَأَنَا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي فَاغفرْ لِي ذُنُوبِي جَميعاً إِنَّهُ لاَ يَغْفرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، وَاهْدني لأَحْسَنِ الأَخْلاَقِ لاَ يَهْدي لأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا، لاَ يَصْرِفُ عَنِّي سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ كُلُّهُ بِيَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ، تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)[1] .

**واته :** ڕووی خۆم کردە ئەو خوایەی ئەرزو ئاسمانەکانی دروست کردووە زۆر پاك و بێگەردو بێ خەوشە ، من لەهاوبەشی دانەران نیم ئەوانەی کە هاوبەش بۆ خودا بڕیار دەدەن، بێگومان هەموو نوێژو خواپەرستی و قوربانیدان و

---

(١) أخرجه مسلم ١/٥٣٤.

ژین و مان‌و مـــردنم بــۆ خــوای پــەروەردگاری خەڵکــە ، ئــەو خوایــەی هــیچ هاوبەشــێکی نیــە ، بــەوە فــەرمانم پێکــراوە ، بەڕاستی مـن یەکێکم لە کۆی موســڵمانانی جیهــان، خوایــە هەر تۆ پاشاو دەسەڵاتداری، جگە لەتۆ هیچ خوایەك نیە ، تۆ پەروەردگاری منـی و منیش بەنــدەی تــۆم، بــەهۆی گونــاە و تاوانەکانم ستەمم لەخۆم کرد ، وادانم بەهەڵەو تاوانەکانم نــا ، دە تــۆش لەهــەموو گونــاە و تاوانــەکانم خــۆش ببــە ، هــیچ کەسێك نیە لەگوناە و تاوانەکان خۆش بێ جگە لەتۆ ، بەرەو باشترین کردارو ئاکارو گوفتــارو ڕێنمــام بکــە ، جگــە لــەتۆ کەس ناتوانێ خەڵك بــەرەو باشــترین کــردارو ئاکــار ڕاســتە ڕێنمایی بکات‌و، کــردەوە خراپــەکانم لێ لابــدە ، جگــە لــەتۆ کەس ناتوانێ کردەوە خراپەکان لە ئینسان لابدا، لە خزمەت تۆم خودایە ، خێرو خۆشی و کامەرانیش هــەر لــەلای تۆیــە ، هەموو خێرو چاکەیەك هــەر لــەلای تۆیــەو تــەنها بەدەســت تۆیە ، قەد خراپە لەلای تۆ نیــەو لــەتۆوە نیــە ، مــن بــەتۆوە ئینسـانم و هەر بۆ لای تۆش دەگەڕێمەوە ، تۆ خوایەکی بــەرزو

**بەڕێزو باڵاو پیرۆزی، داوای لێخۆشبوون هەر لەتۆ دەکەم، هەر بۆ لای تۆش دەگەڕێمەوەو پەشیمان دەبمەوە .**

٣٠/٤- (اللهمَّ رَبَّ جبْرَائِيلَ، وَمِيكَائِيلَ، وَإِسْرَافِيلَ فَاطِرَ السَّموَاتِ وَالأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ)(١).

**واتە : ئەی خوای پەروەردگاری فریشتە جبریل و میکایل و ئیسرافیل و دروستکەری ئەرزو ئاسمانەکان، ئەی زانار ئاگاداری دیارو نادیارو پەنهانەکان، هەر تۆ فەرمانڕەوایی لەنێوان بەندەکاندا دەکەیت لەوەی کەتیایدا ناکۆك و جیاڕاو دووبەرەکن، دە بە ڕوخسەت و توانای خۆت ڕێنمامان بکە بۆ ئەو هەقەی کە لێم بزرەو تیایدا ناکۆك و جیاڕاین، بەڕاستی هەر تۆ ئەو کەسەی کەدەتەوێ کەسێك بەرەو ڕاستە شەقامەکەی ئیسلام ڕاستە ڕێ بکەی .**

---

(١) أخرجه مسلم ٥٣٤/١.

٣١/٥- (اللهُ أَكْبَرُ كَبيراً، أَللهُ أَكْبَرُ كَبيراً، أَللهُ أَكْبَرُ كَبيراً، وَالْحَمْدُ للهِ كَثيراً، وَالْحَمْدُ للهِ كَثيراً، وَالْحَمْدُ للهِ كَثيراً، وَسُبْحَانَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصيلاً) ثَلاَثاً (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ : مِنْ نَفْخِهِ، وَنَفْثِهِ، وَهَمْزِهِ)[١] .

**واته : خوا گەورەی هەرە گەورەیە، خوا گەورەی گەورانە، خوا زۆر گەورەی هەرە گەورەیە، سوپاس و ستایشێکی زۆر بۆ خوای گەورە، سوپاس و ستایشێکی زۆر بۆ خوای گەورە، سوپاس و ستایشێکی زۆر بۆ خوای گەورە، بەیانیان و ئێواران پاکی و بێگەردی بۆ خوای گەورە، سێ جار خۆم بەخوای گەورە لە شەیتانی دوورخراوەو نەفرەت لێکراو دەپارێزم لەفووی، لەتف و جادووی، لەخوتخوتەی خراپ و تێوەژەندی.**

(١) أخرجه أبو داود ١/٢٠٣ وابن ماجه ١/٢٦٥ و أحمد ٨٥/٤ وأخرجه مسلم عن ابن عمر (رض) بنحوه وفيه قصة ١/٤٢٠ .

٦/٣٢- ﴿اللهمَّ لَكَ الْحَمْدُ (١) أنْتَ نُورُ السَّموات وَالأَرْضِ وَمَنْ فيهنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّموات وَالأَرْضِ وَمَنْ فيهنَّ (وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّموات وَالأَرْضِ وَمَنْ فيهنَّ) (وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ ملك السَّموات وَالأَرْضِ) (وَلَكَ الْحَمْدُ) (أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ الْحَقُّ، وَلقَاؤُكَ الْحَقُّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ ﷺ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ) (اللهمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَبكَ آمَنْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفرْ لي مَا قَدَّمْتُ، وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ، وَمَا أَعْلَنْتُ) (أَنْتَ الْمُقَدِّمُ، وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ) (أَنْتَ إِلهي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ)﴾[٢] .

**واته : ئەی خوایە سوپاس و ستایشێکی بێ پایان بۆ تۆ، هەر تۆ ڕوناکی ئەرزو ئاسمانەکان و هەرچی تیایە، سوپاس و**

---

(١) کاتێك پێغەمبەر ﷺ (ئەگەر بۆ شەو نوێژ هەڵسابووایە ئەمەی دەفەرموو).

(٢) البخاري مع الفتح ٣/٣ و ١١٦/١١ و٣٧١/١٣، ٤٢٣، ٤٦٥ و مسلم مختصراً بنحوه ٥٣٢/١ .

ستایش بۆ تۆ، هەر تۆ ڕاگرو بەڕێوەبەری ئەرزو ئاسمانەکان و هەموو شتەکانیانی کەتیایانە، سوپاس و ستایش بۆ تۆ، هەر تۆ تاکە پەروەردگاری ئەرزو ئاسمانەکان و هەموو ئەو شتانەی کە تیایانە، سوپاس و ستایش بۆ تۆ، هەموو مولك و دەسەلاتی، ئەرزو ئاسمانەکان و هەموو شتەکانیان هی تۆیە، سوپاس و ستایش بۆ تۆ، هەر تۆ تاکە پاشاو دەسەلاتداری ئەرزو ئاسمانەکانی، سوپاس و ستایش بۆ تۆ، تۆ هەق و ڕاست و شایانی پەرستنی، بەڵێنت هەقە و دێتەدی، فەرموودەت هەق و ڕاستە، لەڕۆژی دوایی دیداری بڕواداران لەگەڵ تۆ هەق و ڕاستە، بەهەشت و دۆزەخ هەق و ڕاستە، پێغەمبەران هەقن و لەلایەن تۆوە بۆ مرۆڤایەتی ڕەوانە کراون، وە محمدیش ﷺ ڕاستە پێغەمبەری تۆیە، هاتن و بەرپابوونی ڕۆژی دوایش هەق و ڕاستەو هەر ڕوودەدات، خوایە تەسلیمی تۆ بورمەو خۆم ڕادەستی تۆ کردووە، وە پشت و پەنام تەنها بە تۆ بەستۆوە، بڕوام تەنها بەتۆ هێناوە، هەر بۆ لای تۆش دەگەڕێمەوەو پەشیمان دەبمەوە، هەر بەتۆش

بەرەنگاری دوژمنانی تۆ دەبمەوە، حوکم و فەرمانڕەوایش هەر بەتۆ دەکەم، کێشەو دادگاو سکالاّم تەنها دێنمە لای تۆ، خوایە لەوەم خۆشبە کەوا پێش خۆم خستوەو، لەدوای خۆم جێهێشتووەو لەوەی کەشاردومەتەوەو بەنهێنی کردوومە، یا ئەوەی کەشفم کردووەو بەئاشکرا کردوومە، لەهەمووی خۆش ببە، تۆ وە پێش خەری، وە هەر تۆ دواخەری و هەمیشە دەمێنی، جگە لەتۆ هیچ خوایەکی تر نیە، ئەتۆ تاکە خواو پەرستراوی منی، جگە لەتۆ هیچ خوایەکی تر نیە شیاوی پەرستن و خوایەتی بێت .

## ١٧- دوعای ڕکوع

سوننەتە لەو کاتەی کە مرۆڤ ڕکوعە لەناو نوێژ ئەم دوعایانە بخوێنیّ :-

١/٣٣- (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) ثَلاَثَ مَرَّاتٍ.[1] .

**واتە** : پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری گەورە .

---

(١) أخرجه أهل السنن وأحمد وانظر، صحيح الترمذي ١/٨٣ .

٢/٣٤- (سُبْحَانَكَ اللهمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللهمَّ اغْفِرلِي)[١].

**واته** : ئەی خوای پەروەردگارمان پاك و بێگەردی بۆ تۆ، خوایە بە سوپاس و ستایشتەوە لێم ببورەو لێم خۆشبە .

٣/٣٥- (سُبُّوحٌ، قُدُّوسٌ، رَبُّ الْمَلاَئكَةِ وَالرُّوحِ)[٢] .

**واته** : ئەی پەروەردگاری گیانی جبریل و فریشتەکان فرە پاکی و بێگەردی و بێ خەوشی بۆ تۆ .

٤/٣٦- (اللهمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ خَشَعَ لَكَ سَمْعِي، وَبَصَرِي، وَمُخِّي، وَعَظْمِي، وَعَصَبِي، وَمَا اسْتَقَلَّ بِهِ قَدَمِي)[٣]،

**واته** : خوایە بۆ تۆ ڕکوعم بردووەو پشتم کۆم کردووەو چەماندۆتەوە، وەبروام بەتۆ هێناوە، بۆ تۆ تەسلیم و موسڵمان بووم، خوایە چاو و گوێ و ئێسك و مێشك و دەمارەکان و ئەو دوو پێیەم کە پێیان ڕاوەستاوم و سەریەخۆم بۆتۆم زەلیل و

---

(١) البخاري ١/٩٩ ومسلم ١/٣٥٠ .

(٢) مسلم ١/٣٥٣ وأبو داود ١/٢٣٠.

(٣) مسلم ١/٥٣٤ والأربعة إلا ابن ماجه .

زەبوون و ملکەچ کردوون .

٤/٣٦- ( سبحان ذي الجبروت، والملكوت، والكبرياء، والعظمة)[1]

**واتە** : پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە خاوەنی دارو دەسەلاّت و موڵك و ماڵ و گەورەیی و تواناو بوونەوەرێکی زۆر فرەو بەهێزە .

## ١٨- دوعای هەستانەوە لە ڕکوع

١/٣٨- (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)[2] .

**واتە** : خوای تاك و تەنیا گوێی لەو کەسە بوو کەسوپاس و ستایشی کرد .

٢/٣٩- (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، حَمْداً كَثيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ)[3]،

واتە : ئەی پەروەردگارمان سوپاس و ستایش بۆ تۆ، بە

---

(١) ابو داود ١/٢٣٠ والنسائي واحمد واسناده حسن.

(٢) البخارى مع الفتح ٢/٢٨٢ .

(٣) البخارى مع الفتح ٢/٢٨٤ .

**سوپاس و ستایشێکی زۆرو زەوەند کە پاکی و پیرۆزی تیایە .**

٣/٤٠- (مِلْءَ السَّموات وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شئتَ منْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجد أَحَقُّ ما قَالَ الْعَبْدُ، وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ اللهمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ)[1] .

**واتە : خوایە پڕ بە ئەرزو ئاسمانەکان و پڕ بە هەرشتێکی تریش جگە لە ئەرزو ئاسمانەکان کەتۆ دەتەوێ سوپاسی و ستایش چاك و پاك و پیرۆز بۆ تۆی پەروەردگار، خاوەن سوپاس و ڕێزو شکۆو سەربڵندی، شیاوترین شت کەبەندە بیلێ، ئەوەیەکە دەڵێ : ئەی خوایە هەموومان بەندەی تۆین، خوایە هیچ ڕێگرێك نیە لەبەردەم ئەوەی کەتۆ پێی نادەی و لێی یاساغ و قەدەغە دەکەی، هیچ خاوەن سەروەت و سامان و داراییەکیش سوودی نیە جگە لەهی تۆ، سەروەت و سامان و دەوڵەمەندیەکیش سوودی نابێت، سوودو قازانج لەتۆوەیە.**

(١) مسلم ١/ ٣٤٥ .

## ١٩-دوعای كاتی كڕنۆش بردن ( السجود )

١/٤١- (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى) ثَلاثَ مَرَّات [١] .

**واته : پاكی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری هەرە بەرزم، (دەبێ سێ جار ئەوە بگوترێ) .**

٢/٤٢- (سُبْحَانَكَ اللهمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللهمَّ اغْفِرْلِي) [٢] .

**واته : ئەی خوای پەروەردگارمان بەسوپاسەوە پاكی و بێگەردی بۆ تۆ، لێم خۆش ببە.**

٣/٤٣- (سُبُّوحٌ، قُدُّوسٌ، رَبُّ الْمَلاَئِكَةِ وَالرُّوحِ) [٣] .

**واته : پاكی و بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگاری گیان و فریشتەكان .**

٤/٤٤- (اللهمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِيَ لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللهُ

(١) أخرجه أهل السنن وأحمد وانظر، صحيح الترمذي ١/٨٣ .

(٢) البخراي ومسلم وتقدم تخريجه برقم ٣٤ .

(٣) مسلم ١/٥٣٣ وتقدم برقم ٣٥ .

أحْسَنُ الْخَالقِينَ)[1].

**واتە** : ئەی خوای گەورە وا کڕنۆشم بۆتۆ برد، وە بڕوام بەتۆ هێنا، وە بۆتۆ تەسلیم و موسڵمان بووم، ڕووی من کڕنۆشی بۆ ئەو خوایە بردووە، دروستی کردووە، وێنەی کێشاوە، چاو و گوێی پێ داوە، پاك و بێگەردی و بەدەسەلاتی بۆ ئەو خوایە (اللە)یەی کە باشترین دروست کەرو بەدیهێنەرە .

٤٥/٥- (سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ، وَالْمَلَكُوتِ، وَالْكِبْرِيَاءِ، وَالْعَظَمَةِ)[2] .

**واتە** : پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە خاوەنی دەسەلاتە، خاوەنی مولك و ماڵ و توانار گەورەیی بوونەوەرێکی زۆر فرەو بەهێزە .

٤٦/٦- (اللهمَّ اغْفِرْلِي ذَنْبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ وجِلَّهُ، وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ

---

(١) مسلم ١/٥٣٤ وغيره .

(٢) أبو داود ١/٢٣٠ وأحمد، والنسائي وصححه الألباني في صحيح أبي داود ١/١٦٦ .

وَعَلاَنِيَتَهُ وَسِرَّهُ)[1] .

**واته** : خوایه لەهەموو تاوان و گوناهەکانم خۆش بە، لەتاوانە بچوکەکان و گەورەکان، لەوردو درشتەکان، لەکەم و زۆرەکان، لەتاوانەکانی سەرەتاو کۆتا، لە تاوانە ئاشکراو نیهنیەکان .

٧/٤٧- (اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ وَأَعُوذُبِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ)[2] .

**واته** : خوایە بەڕەزامەندی تۆ، خۆم لەسزاو خەشم و توڕەبوونت دەپارێزم، بەساغ و سەلامەتیو لێبوردەییت خۆم لەسزاو ئێش و ئازار دەپارێزم، بەتۆ خۆم لەتۆ دەپارێزم، خوایە هەرگیز ناتوانم بەو شێوەیەی کە خۆت ستایشی خۆت کردووە، من سوپاس و ستایشت بکەم، چاکەو ستایشەکانت ئەژمار بکەم .

---

(١) مسلم ١/ ٣٥٠ .

(٢) مسلم ١/ ٣٥٢ .

## ٢٠- دوعای دانیشتن لەنێوان دوو کڕنۆشدا

١/٤٨- (رَبِّ اغْفِرْ لِي رَبِّ اغْفِرْلِي)[١] .

**واتە : ئەی پەروەردگارا لێم خۆشبە، ئەی پەروەردگارا لێم خۆشبە .**

٢/٤٩- (اللهمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاهْدِنِي، وَاجْبُرْنِي، وَعَافِنِي، وَارْزُقْنِي، وَارْفَعْنِي)[٢] .

**واتە : خوایە لێم خۆشبە، ڕەحم پێ بکە، هیدایەتم بدە، وە ڕاستە ڕێم بکە، چاکم بکەوە، تواناو دەسەڵاتم پێ بدە، لەش ساغ و پارێزراو و بێ بەڵام بکە، رزق و ڕۆزیەکی چاك و حەلال و فراوانم پێ بدە، پلەو پایەم لای خۆت بەرز بکەوە .**

---

(١) أبو داود ١/٢٣١ وانظر، صحيح ابن ماجه ١/١٤٨ .

(٢) أخرجه أصحاب السنن إلا النسائي وانظر، صحيح الترمذي ١/٩٠ وصحيح ابن ماجه ١/١٤٨ .

## ٢١- دوعای کڕنۆشی قورئان خوێندن ( سجدة التلاوة )

٥٠/١- (سَجَدَ وجهي لِلَّذي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَولِهِ وَقُوَّتِهِ ﴿فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الخلقِينَ﴾[1]).

**واته** : ڕووی من کڕنۆشی بۆ ئەو خوایە بردووەکە دروستی کردووە، بەهێزو توانای خۆی چاو و گوێی بۆ داڕشتووەو بینایی چاو و بیستنی گوێی پێ بەخشیوە .

٥١/٢- (اللهمَّ اكْتُبْ لِي بِهَا عِنْدَكَ أَجْراً، وَضَعْ عَنِّي بِهَا وِزْراً، وَاجْعَلْهَا لِي عِنْدَكَ ذُخْراً، وَتَقَبَّلْهَا مِنِّي كَمَا تَقَبَّلْتَهَا مِنْ عَبْدِكَ دَاوُدَ)[2] .

**واته** : خوایە دە بەهۆی ئەم کڕنۆش و قورئان خوێندنە خێرو پاداشتێکم لەلایەن خۆتەوە بۆ بنوسە، گوناه و تاوانێکم لێ لادەو لەسەر هەڵگرە، لەلایەن خۆت بۆم بکە

---

(١) الترمذی ٤٧٤/٢ وأحمد ٣٠/٦ والحاكم وصححة و وافقه الذهبي ٢٢٠/١ والزيادة له .

(٢) الترمذی ٤٧٣/٢ والحاكم وصححة و وافقه الذهبي ٢١٩/١ .

تویشووی ڕۆژی دواییم و لیم گیرا بکه، هەر وەك لە حەزرەتی داودی بەندەی خۆت گیرات کرد (سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت) .

## ٢٢- دەقی تەحیات خوێندن لە نوێژدا

٥٢- (التَّحِيَّاتُ لله، والصَّلَوَاتُ، الطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)[١] .

واته : هەرچی سوپاس و ستایش و سەلام و ڕێزو دروودپاکی و بێگەردی و بێ خەوشی هەیە بۆ خوای گەورەیە، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دروودو سەلام و بەزەیی و پیت و بەرەکەتی خوات لەسەر بێ، دروودو سەلامیش لەسەر ئێمەو لەسەر بەندە چاکەکانی خوای گەورە بێ،

(١) البخاری مع الفتح ١٣/١ ومسلم ٣٠١/١ .

گەواهی دەدەم کە جگە لەخوا (الله) هیچ خوایەکی بەهەق نیە، گەواهیش دەدەم کە محمد ﷺ بەندەو پەیامبەری خوایە.

## ٢٣- سەلاوەت لێدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لەدوای تەحیات خوێندن

١/٥٣- (اللهمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حميدٌ مَجيدٌ، اللهمَّ بارِكْ عَلَى مُحُمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)[1].

**واتە :** خوایە درودو ڕەحمەت و بەرەکەتی خۆت بەسەر پێغەمبەرو خانەوادەکەیدا برێژە، هەروەك بەسەر حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەرو خانەوادەکەیدا ڕشتووە، چونکە تۆ زۆر سەخی و سوپاسگوزارو سەربەرزو سەر بلندو شکۆداری، خوایە پیت و بەرەکەت بەسەر موحەممەدو خانەوادەکەیدا

---

(١) البخاری مع الفتح ٦/٤٠٨.

**بڕێژە، هەروەك بەسەر حەزرەتی ئیبراهیم و ماڵ و خێزانیتدا ڕشتووە، تۆ خوایەکی زۆر سەخی و سوپاسگوزارو شکۆداری .**

٢/٥٤- (اللهمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّد وَعَلَى أَزْوَاجه وَذُرِّيته، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آل إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّد وَعَلَى أَزْواجه وَذُرِّيَّته، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)[1] .

**واته : خوایە درودو ڕەحمەت و بەرەکەتی خۆت بەسەر پێغەمبەرو خانەوادەکەیدا بڕێژە، هەروەك بەسەر حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەرو خانەوادەکەیدا ڕشتووە، چونکە تۆ زۆر سەخی و سوپاسگوزارو بەرزو بڵندو شکۆداری، خوایە پیت و بەرەکەت بەسەر موحەممەدو خانەوادەکەیدا بڕێژە، هەروەك بەسەر حەزرەتی ئیبراهیم و ماڵ و خێزانیتدا ڕشتووە، تۆ خوایەکی زۆر سەخی و سوپاسگوزارو شکۆداری .**

---

(١) البخاري مع الفتح ٦/٤٠٧ ومسلم ١/٣٠٦ واللفظ له.

## ٢٤- دوعا كردن له پاش ته‌حیاتی كۆتایی پێش سه‌لام دانه‌وه

٥٥/١- (اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُبكَ منْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، ومِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)[١] .

**واته** : خوایه به‌تۆ خۆم له‌سزاو ئازاری دۆزه‌خ و ئاشوب‌و ئاژاوه‌ی ژیان و مردن و له‌خراپه‌ی مه‌سیحی ده‌جال ده‌پارێزم .

٥٦/٢- (اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَسِيحِ، الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحيَا والْمَمَاتِ، اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمْ)[٢] .

**واته** : خوایه به‌تۆ خۆم له‌سزاو ئێش‌و ئازاری ناو گۆڕو له ئاشوب و ئاژاوه‌و به‌لای مه‌سیحی ده‌جال و مردن و ژینم ده‌پارێزم وه خۆم ده‌پارێزم له‌گوناه و تاوان و قه‌رزاری .

---

(١) البخاری ١٠٢/٢ ومسلم ٤١٢/١ واللفظ لمسلم .

(٢) البخاري ٢٠٢/١ ومسلم ٤١٢/١ .

٣/٥٧- (اللهمَّ إنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً، وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرلِي مَغْفِرَةً، مِنَ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي إنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ)[1] .

**واتە : خوایە بەڕاستی مـن ستەمێكی زۆرم لـەخۆم كـرد بەهۆی ئەو گوناه و تاوانانـەی كـەكردوم و خـۆم شایـستەی خەشم و ناڕەزایی تۆوسزای دۆزەخ كرد ، ئێستاش هـیچ كـەس نییە كە لەگوناه و تاوانەكان خۆش بێ جگە لەتۆ، تۆش لێم خۆشبە ، بەلێخۆشبوونێك كە ڕەحمەت و لێخۆشـبوون تـەنها لەلای تۆیە ، بەڕاستی هەر تۆ بەبەزەیی و لێخۆشبووی .**

٤/٥٨- (اللهُمَّ اغْفِرَ لِي مَا قَدَّمْتُ، وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ، وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَسْرَفْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ، وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إلَهَ إلاَّ أَنْتَ)[2]،

**واتە : خوایە لەو گوناه و تاوانانەم خۆشـبە كـەپێش خـۆم خستونەو دوای خۆم خستونە ، بەئاشكراو بـەنهێنی كـردومن**

(١) البخاري ١٦٨/٨ ومسلم ٢٠٧٨/٤ .

(٢) مسلم ٥٣٤/١ .

یا زێدەڕۆیی‌یم تیا کردون، وە لەوانەی کەتۆ لەمن زۆر زیاتر پێیان ئاگاداری، هەر تۆ پێشخەرو پاشخەری سزاو پاداشتی خێرو چاکەو گوناه و تاوانەکانی، جگە لەتۆ هیچ خوایەکی تری بە هەق و شایستەی پەرستن و خوایەتی نییە.

٥٩/٥- (اللهمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ، وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ)[١] .

**واتە** : خوایە لەسەر زیکرو یاد کردنتو، لەسەر سوپاسکردنی خۆت و لەسەر باشترین پەرستنی خۆت هاوکاری و کۆمەکیم بکەر یارمەتیم بدە تا بیانکەم .

٦٠/٦- (اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنيا وَعَذَابِ الْقَبْرِ)[٢].

**واتە** : خوایە بەتۆ خۆم لە قرچۆکیو ڕەزیلی و ڕژدی و

---

(١) أبو داود ٨٦/٢ و النسائي ٥٣/٣ وصححة الألباني في صحيح أبو داود ٢٨٤/١ .

(٢) البخاري مع الفتح ٣٥/٦.

**ترسنۆکی دەپارێزم، وە خۆم لـەوە دەپـارێزم کـە بم گێرێتـەوە سەر زەلیلترین تەمەن و توانا، وە خۆم دەپارێزم لە ئاشـوب و ئاژاوەو بەلاّی دونیاو سزاو ئازاری گۆڕ .**

٧/٦١- (اللهمَّ إنِّي أسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَأَعوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ)[١] .

**<u>واتە</u> : خوایە داوای بەهەشـتی نـەبڕاوەت لیّ دەکـەم، پـەنا بەتۆ دەگرم لە ئاگری دۆزەخ .**

٨/٦٢- (أَللهمَّ بعلْمكَ الْغَيْبَ وَقُدْرَتكَ عَلَى الْخَلْق أَحْيني مَـا عَلمْتَ الْحَيَاةَ خَيْراً لِي وَتَوَفَّني إذا عَلمْتَ الْوَفَاةَ خَيْراً الي، اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَشْيَتَكَ في الْغَيْب وَالشَّهَادَة، وَأَسْأَلُكَ كَلمَةَ الْحَقِّ فِي الرِّضا وَالْغَضَب، وَأَسْأَلُكَ الْقَصْدَ فِي الْغنَى وَالْفَقْر، وأسْأَلُكَ نَعيماً لاينفد وأسْأَلُكَ قرة عين لاَتنقطع، وَأَسْأَلُكَ الرِّضَا بَعْـدَ القضاء وأسألك برد العيش بعد الْمَوْت، وأسْأَلُكَ لَذَّةَ النَّظَرِ إلَى وَجْهِكَ وَالشَّوْقَ إِلَى لِقَائِكَ فِي غَيْرضَرَّاءَ مُضرَةَ وَلاَ فِتْنَةٍ مُضِلَّة،

---

(١) أبو داود وانظر، صحيح ابن ماجة ٣٢٨/٢ .

اللهمَّ زَيِّنَّا بِزِينَةِ الإِيمَانِ وَاجْعَلْنَا هُداةً مُهْتَدِينَ)[1].

**واته** : خوایە بەزانستی پەنهان و بەتوانای سەر بوونەوەرت، بمژێنە لە ژیاندا تا ئەو کاتەی کەتۆ دەزانی ژین بۆ من خێری تیایە، وە بمرێنە ئەگەر دەزانی مردن لە ژیاندا خێری تیایە بۆ من، خوایە داوای لێترسانت لێدەکەم بەئاشکراو بەنهێنی، داوای ووشەو قسەی هەق و ڕاستت لێ دەکەم لەکاتی ڕازی بوون و توڕەبوونم کەهیچی خراپ و نا شەرعی نەلێم، داوای مامناوەندیت لێ دەکەم لەکاتی هەژاری و دەوڵەمەندیدا کە تووشی ناشوکری نەبم، داوای نازو نیعمەت و چاکەت لێ دەکەم کە هەرگیز کۆتایی نایێ و لەناو ناچێ، داوای چاو ڕوونییەکت لێ دەکەم کە هەرگیز کۆتایی نەهێت و نەپچرێت، داوای ڕازی بوونت لێ دەکەم لەسەر ئەو بڕیارەی کە بەسەرمدا دەدەی، داوای ژیانێکی خۆش گوزەرت لێ دەکەم، دوای مردنم لە گۆڕو دوا ڕۆژدا، داوای تام و چێژ

---

(١) النسائي ٣/٥٤، ٥٥ وأحمد ٤/٣٦٤ وصححه الألباني في صحيح النسائي ١/٢٨١ .

لێوەرگرتنت لێ دەکەم لە ڕوانینت، داوای شەوق و شەیداییت لێ دەکەم کاتێك کە بەتۆ دەگەم بەبێ ئەوەی کە زەرەرو زیـانم پێ بگا، دوورچاری هیچ ئاشوب و ئاژاوەیەکی گومڕا کـەر بم، خوایـە بـەجوانی بـیرو بـاوەڕی ئیـسلامەتی و خواپەرسـتی جوانمـان بکـەی و بمـان رازێنیتـەوە، وە بمانکەیتـە ڕابـەرو پێشەنگی ڕێنما کراوەکانی ئیسلام .

٩/٦٣- (اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ يَا أَللهُ بِأَنَّكَ الْوَاحِدُ الأَحَدُ الـصَّمَدُ الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ، أَنْ تَغْفِـرَ لِـي ذُنُوبِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ)[١] .

**واتە** : بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبـان خوایـە کـە تـۆ (الله)ی خوای تاك و هەرە تەنیای، ئەو خوایەیە کە لەهەموو کەس بێنیازەو هەموو کەسیش پێویستی بەوە، ئەو خوایـەی کە لەکەس نەبووەو کەسیش لەو نەبووە، ئەو خوایەی کەهیچ شەریك و هاوتاو هاوبەشـێکی نییـە، لـە هـەموو گونـاه و

(١) أخرجه النسائي بلفظة ٣/٥٢ وأحمد ٤/٣٣٨ وصححة الألباني في صحيح النسائي ١/٢٨٠ .

تاوانەکانم خۆش بە کـە کـردوومن چـونکە هـەر تـۆ تاکـە لێخۆشبەرو بەزەیی بەرانبەر بەندە تاوانبارەکانت .

٦٤/١٠- (اللهمَّ إني أسْألُكَ بأنَّ لَكَ الْحَمْدُ لاَ إلـه إلاَّ أنْـتَ وَحْدَكَ لاَ شَريكَ لَكَ، الْمَنَّانُ، يَا بَديعَ السَّموَاتِ وَالأَرْضِ يا ذَا الْجَلاَلِ وَالإكْرَامِ، يَا حَيُّ يا قَيُّومُ إنِّي أسْألُكَ الْجَنَّةَ وَأعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ)[1] .

**واتە :** خوایە بەوەی کە سوپاس و ستایش هـەر بـۆ تۆیـە، جگە لەتۆ هیچ خوایەکی بەهەق نیە، هەر تۆ تاك و تـەنیاو بێ شەریکی، هەر تۆ بێی نیازو مەبەسـت و منـەتکردنی، ئەی داهێنەرو دروستکەرو جوانکەری ئەرزو ئاسمانەکان، ئەی خاوەن پلەو پایەو ڕێزو شکۆ، ئـەی خـوای هەمیـشە نـەمرو زینـدوو ڕاگـری ئـەرزو ئاسمانـەکان و بوونـەوەر، مـن داوای بەهەشت و لێخۆشبوون هەر لەتۆ دەکەم، هەر بـەتۆش خـۆم لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزم .

---

(١) رواه أهل السنن وانظر، صحيح ابن ماجه ٢/٣٢٩ .

١١/٦٥- (اللهمَّ إنِّي أَسْأَلُكَ بأَنِّى أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللهُ لاَ إلهَ إلاَّ أَنْتَ الأَحَدُ الصَّمَدُ الَّذي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ)[١] .

**واته : خوایه من داوای هەموو شتێك هەر لەتۆ دەكەم، وە گەواهی دەدەم كە جگە لەتۆی تاك و تەنیا هیچ خوایەكی تری بەهەق و پەرستراو نیە، تۆ تاك و تەنیاو بێ نیازی لەهەموو خەڵك، پێویستیت بەكەس نیە، هەموو كەسیش پێویستی بەتۆیە، تۆ لەكەس نەبوری، كەسیش لەتۆ نەبووە، هیچ كەسیش هاوتار هاوشێوەو هاوبەشی ژیان و توانساو بەڕێوە بردنی تۆ نی یە .**

## ٢٥- زیكرەكانی دوای سەلامدانەوە لە نوێژ

١/٦٦- (أَسْتَغْفِرُ اللهَ (ثَلاثاً) اللهمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ السَّلاَمُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرامِ)[٢] .

---

(١) أبو داود ٦٢/٢ والترمذي ٥١٥/٥ وابن ماجه ١٢٦٧/٢ وأحمد ٣٦٠/٥ وانظر، صحيح ابن ماجه ٣٢٩/٢ وصحيح الترمذي ١٦٣/٣ .

(٢) مسلم ٤١٤/١ .

واته : سێ جار بڵێ خوایە داوای لێخۆشبوون و لێبوردن هەر لەتۆ دەکەم، ئینجا بڵێ، خوایە تۆ خوایەکی ئاشتیخوازو سەلامەت و بێ زیانی، ئاشتی و سەلامەتیش هەر لەتۆیە، ئەی خوای خاوەن شکۆو پلەو پایە تۆ خوایەکی زۆر بەرزو بڵندو دەسەڵاتدارو بەتوانای .

٦٧/٢- (لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللهمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ)[1] .

واتە : هیچ خوایەکی بەهەق نیە جگە لەو خوایەی کە تاك و تەنیایە، هیچ شەریك و هاوبەشێکیش نیە، هەمور سوپاس و ستایش و موڵك و دەسەلاتێك هەر هی ئەوە، بەسەر هەمور شتێکیش لە ژیاندا بەهێزو تواناداره، خوایە هیچ ڕێگرێك نیە بۆ ئەوەی کە تۆ پێی ببەخشی، هیچ بەخشەرێکیش نیە بۆ ئەوەی کەتۆ ڕێگری لێ بکەی و پێی

(١) البخاري ٢٥٥/١ ومسلم ٤١٤ .

نەبەخشیت، هیچ دەوڵەمەندو خاوەن دەسەڵات و دارابیەكیش ناتوانێ سورد بەكەسێك بگەیێنن ئەگەر تۆ سوودی پێ نەگەینی، چونكە هەموو پلەو پایەو سەروەت و سامان و دەوڵەمەندی و دارابیەك هەر لەتۆوەیە .

٣/٦٨- (لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ، لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ، وَلاَ نَعْبُدُ إلاَّ إيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ، لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرونَ)[1].

واتە : هیچ خواو پەرستراوێكی بەهەق و شایستە نیە جگە لەخوای كردگار كە (الله)یە، تاك و تەنیایەو هیچ شەریك و هاوبەشێكی نیە، هەموو دەسەلاتێك هی ئەوە، هەموو سوپاس و ستایشێك هەر بۆ ئەوە، ئەو خوایە بەسەر هەموو شتێكی بوونەوەردا زۆر بەتواناو چاودێرە، هیچ هێزو توانایەك نیە مەگەر بەو نەبێ، هیچ خوایەك نیە تەنها ئەو (الله)

---

(١) مسلم ١/٤٥١ .

نەبیٚ، کەس ناپەرستین تەنها ئەو نەبیٚ، هەموو نازو نیعمەت و چاکەو بەخششێك هەر هی ئەوە، سوپاس و سەنای چاك و هەرە جوان هەر بۆ ئەوە، جگە لە (الله) هیچ خوایەکی بەهەق نیە، ئایینی پاك و پیرۆز هەر هی خوایە، ئەگەر کافرەکانیش پێیان ناخۆش بیٚ و بیبیزێنن، دەبیٚ لەگەڵ خوای تاك و تەنیاو ئایینەکەی پاك و دڵسۆز بین .

٤/٦٩- (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لله، والله أَكْبَرُ (ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ) لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) [(١)] .

**واتە :** پاکی و بێگەردی بۆ خوای کردگار، سوپاس و ستایشی بیٚ پایان بۆ خوای گەورە، خوای کردگار لە هەموو شتێکی بوونەوەر گەورە ترە (٣٣ جار دەگوتریٚ)، سوپاس و ستایش و موڵك و دەسەڵات هەر بۆ ئەوە، وە ئەو بەسەر

---

(١) واتە: (هەرکەسێك لەدوای هەرنوێژێك ئەمە بڵیٚ لەگوناهەکانی دەبووردریٚ ئەگەر وەکوو کەفی دەریاش وابیٚ) مسلم ٤١٨/١ .

هـــەموو شـــتێکی ژیـــان و بوونـــەوەردا زاڵ و بـــە توانـــاو بـــە دەسەڵاتە .

٧٠/٤- بسم الله الرحمن الرحيم ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤﴾ (سورة الأخلاص)

**واتە:** خوای کردگار کە (الله)یە خوایەکی تاك و تەنیایە و، خوایەکی بێ نیازو مەبەستە لە خەڵك و پێویستی بەهیچ کەس و کائینێك نیە، هەموو کەس و گیانلەبەرێکیش پێویستی بەو خوایەیە بۆ پێداویستیەکانی ژیانی، ئەو خوایە لەکەس نەبووەو کەسیش لەو نەبووە، وە هیچ کەس و شتێکیش وەکو ئەو نیەو، هاوتاو هاوشێوەی ئەو نیەو، هیچ هاوبەشێکی نیە .

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ۝٣ وَمِن شَرِّ

ٱلنَّفَّـٰثَـٰتِ فِى ٱلۡعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾ (سـورة الفلق)

**واتە :** **بەناوی خوای بەخشندەر میهرەبان ئـەی محمـد ﷺ : بلّێ خۆم دەپارێزم بە پەروەردگاری دروستکەری بوونـەوەر لـە زەرەرو زیـان و ئـەوەی کـە دروسـتی کـردووەو، لـە خراپـەی تاریکی ئەو کـاتێ دادێ، لـە زەرەرو زیـان و خراپـەی جـادو کەران کاتێ فوو لەگرێ کوێرەکان دەکەن و، لەخراپـەی ئـەو ئێرەبەرو ڕژدانەی کە حەسودی و بەخیلی بەخەلّك دەبەن .**

بسم الله الرحمن الـرحيم ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَـٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسۡوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ

ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾ (سورة الناس) دواى هەموو نوێژێك [1] .

**واتە:** بەناوى خواى بەخشندەو میهرەبان، ئەى محمد ﷺ بڵێ : خۆم دەپارێزم بە خواى بوونەوەر، ئەو خوایەى کە پاشاو دەسەلاتدارى خەڵکیەو، پەرستراوى خەڵکیە، وەلەزەرەرو زیانو خراپەى وەسوەسە پەیداکەرى پەنهان و نادیار، ئەوەى کە خوتخوتەو وەسوەسەى خراپ دەخاتە ناو دڵ و دەروون و سینەى خەڵکى لە جنۆکەو ئینسانەکان.

**ئەم سورەتانە لەدواى هەموو نوێژێك دەگوترێن .**

٦/٧١- ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَىُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوۡمٌۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٲتِ وَمَا فِى ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشۡفَعُ عِندَهُ ۥۤ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ

---

(١) أبو داود ٢/٨٦ والنسائى ٣/٨٦ وانظر، صحيح الترمذى ٢/٨ . ئەم سێ سورەتە پێیان دەگوترێت پەناگەکان (المعوذات) وانظر، فتح الباري ٩/٦٢ .

أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ (سورة البقرة).

عَقِبَ كُلِّ صَلاةٍ [1] .

**واتە : ئـەو خوايـەی کـە (الله)يـە جگـە لـەو هـيچ خـواو پەرستراوێکی بەهەق و ڕاست نییە، ئـەو خوايـەی هەميـشە زيندووەو ڕاگرو بەڕێوەبەرو بەرپاکەری بوونەوەرە، قەت خـەوو وەنەوزەو بۆرژين نايگرێ و بەسەری دانـايێ، هەرچـی لـەنێو ئەرزو ئاسمانەکانە هی خوايـە، ئايـا ئـەو کەسـە کێيـە کـە**

---

(١)(هەرکەسێك لەدوای هەر نوێژێك ئەمە بخوێنێ ئەوا هیچ شتێ قەدەغـەی ناکات لەوەی بـچێتە بەهەشـتەوە تـەنيا مـردن نـەبێ، واتـە ئەگـەر بمـرێ دەچێتە بەهەشـتەوە) النـسائي في عمـل اليـوم والليلـة بـرقم ١٠٠، وابـن السني بـرقم ١٢١ وصـححه الألبـاني في صـحيح الجامع ٣٣٩/٥ وسلـسلة الأحاديث الصحيحة ٦٩٧/٢ برقم ٩٧٢.

لەڕۆژی بەرێ کە ڕۆژێکی زۆر ترسناك و سەختە لەلای خوای گەورە تکاو پاڕانەوە بۆ ئۆممەتەکەی دەکات، جگە لە پێغەمبەر ﷺ ئەویش تەنها بە ڕوخسەت و مۆڵەت و ڕێگە پێدانی خوای گەورەیە، ئەو خوایە هەموو شتێك دەزانێ کە لەدونیادا لەنێوان دەستی ئینسانەکانە، وە ئەوەی کە لەدوایان جێ دەمێنێ و لە دوا ڕۆژدا بۆیان ئامادەکراوە، هیچ کەسێك هیچ شتێك لە زانست و زانیاری خوای گەورە نازانێ، مەگەر ئەوەی کە خۆی بیەوێ بزانێ و فێری بکا، فراوانی کورسی توانار دەسەلاتی خوای گەورە هەموو ئەرزو ئاسمانەکانی گرتۆتەوەو، پاراستنی ئەم ئەرزو ئاسمانەش لەلایەن خوای گەورە شتێکی زۆر سادەو ئاسانەو هیچ گرانو زەحمەت نییە، چونکە ئەم خوایە زۆر بەرزو بلندو گەورەو پایەدارو بەتوانایە (لەدوای هەموو نوێژێك) .

٧/٧٢-( لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ

الْحَمْدُ يحيي ويميت وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)[1] .

**واته** : هیچ خوایەكی بەهەق نیە جگە لەو خوایەی كە (الله)یەو تاك و تەنیایە، هیچ شەریك و هاوبەشێكی نیە لە ژیان بەرێوەبردندا، سوپاس و ستایش و تواناو دەسەلاَت و پادشایەتی هەر بۆ ئەوە، ئەو خوایە ژیان بەخش و مرێنەرو، هەموو گیان لەبەرێك لە بوونەوەردا دەژێنیٚ و دەمرێنیٚ، وە لەسەر هەموو شتێكیش تواناداروبەدەسەلاَتە، ئەمە (١٠) جار دوای نوێژی ئێواران و بەیانیان دەخوێندرێت .

٨/٧٣- (اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْماً نَافِعاً، وَرِزقاً طَيِّباً، وَعَمَلاً مُتَقَبَّلاً)[2] .

**واته** : دوای ئەوەی كە نوێژكار لە نوێژی بەیانیان سەلام دەداتەوە دەڵیٚ : خوایە داوای زانستێكی زۆر بەسوودو ڕزق و ڕۆزیەكی زۆر فراوان و پاك و حەلال و كردەوەی شایستەو قبول كراوت لیٚ دەكەم .

---

(١) رواه الترمذي ٥/٥١٥ وأحمد ٤/٢٢٧ وانظر، تخريجه في زاد المعاد ١/٣٠٠ .

(٢) ابن ماجه وغيره وانظر، صحيح ابن ماجه ١/١٥٢ ومجمع الزوائد ١١١/١٠ .

## ٢٦- دوعای نوێژی پرسکردن به خوای گەوره
## ( دعاء صلاة الاستخارة )

٧٤- قَالَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِاللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ : كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا الاسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ كُلِّهَا كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ : (إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ لِيَقُلْ : اللهمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ، وَلاَ أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، اللهمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ – وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ- خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي –أَوْ قَالَ : عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ – فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي – أَوْ قَالَ : عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ – فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ)[١].

---

(١) البخاري ٧/١٦٢ .

جابڕی کوڕی عبدالله ﷺ دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کاروبارەکانی ژیانـدا پرسـکردن (ئیـستخارە)ی فێـر دەکردین و، دەیگووت : ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەم و گرفتی کارێکی هەبوو، باجگە لە نوێژی فـەرز، دوو ڕکعـات نوێـژ بکات، لە کۆتایی ڕکعەتی دووەم یا لە کۆتایی نوێژدا بڵێ : خوایە من پرسیار بە زانستی تۆ دەکەم و خێرو چاکە لە تـۆ دەخوازم، بە توانا و دەسەڵاتی تۆ داوای توانستیت لێ دەکەم، داوا لە فەزل و بەخششی فراوان و گەورەی تۆ دەکەم، چونکە تۆ بەتوانای و دەتوانی هەمو شتێك بکەی، من بێ توانـام و ناتوانم بێ ویستی تۆ هیچ شتێك بکەم، تـۆ هـەموو شـتێك دەزانی و لێت دیارو ئاشکرایە، من بێ تۆ هیچ نـازانم و لـێم دیار نیە چی بکەم باشـە، چـونکە تـۆ فـرە زانـای نادیـارو پەنهانەکانی، خوایە ئەگەر دەزانی ئەو کارەم (ناوی کارەکەت دێنی) بۆ ئایین‌و دونیاو خێرو چاکەی بۆمن تیایـە، بـۆ مـن سووك و ئاسان بکەو هاوکاریم بکە لەسەر کردنـی و توانـاو هێزم پێ ببەخشە بۆ کردنی، پاشان بۆم بەخێر بگێڕەو لێمـی پیرۆز بکە، ئەگەر دەزانی ئـەم کـارە زەرەرو زیـان و خراپـەی

تیایە بۆ دین و دونیاو ژیان و گوزەران و پاشە ڕۆژی کارم لـە ئێستاو دوا ڕۆژ، زوو و درەنگ، لێم لادەو، منیش لە کارەکـە لادە، بەڵکو هەر چۆنێك بێ بۆم بەخێر بگێڕەو بڕیاری خێـرو چاکەم بۆ بدە، بەو کارەم ڕازی و قایـل بکـە کـە بـۆم بڕیـار دەدەی و بۆم دێنیە پێشەوە .

بێگومان ئەو کەسەی کە پرس بە خـودا دەکـا، لـە ڕێگـەی دوعاو پاڕانەوەو ئەنجامـدانی ئیـستخارە، پـرس و ڕاوێـژ بـە خەڵکی بڕوادار دەکا، لەسەر کارەکەی جێگیرو چەسپاو دەبـێ قـەت زەرەر ناکـا، چـونکە خـوای گـەورە سـەبارەت بـەوە دەفـــەرمووێ: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ (١٥٩) ال عمران.

**واتە:** لە کاروباری ژیانتاندا پرسیان پێ بکەن، واتـە پـرس بە ئینسانی چاك و شارەزاو پـسپۆر بکـەی لـەبواری خـۆی، ئەگەر ئیرادەتان چەسپاند بۆ ئەوەی کارەکە بکەن، ئەوا پشت بەخوا ببەستن و کارەکە بکەن و لێی دوو دڵ مەبن .

## ٢٧- زیكرەكانی ئێواران و بەیانیان

الحَمْدُهُ للهِ وَحْدَهُ وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى مَنْ لا نَبِـــيَّ بَعْدَهُ [(١)].

**دەبێ ئینسان بەناوی خواو سوپاس و ستایشكردنی و سەلات و سەلام لێدان لەسەر دیداری پێغەمبەر ﷺ دەست پێ بكاو، بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوای تاك و تەنیا، درووردو سڵاوی بێ پایان لەسەر ئەو پێغەمبەرەی كە هیچ پێغەمبەرێكی لە دوادا نیە .**

١/٧٥- أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانَ الرَّجِيمِ ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ

---

(١) پێغەمبەر فەرموویەتی: (ئەگەر هاونشین بم لەگەڵ كۆمەڵە كەسانێك كەخەریكی یادی خوای گەورەبن هەر لەنوێژی بەیانیە هەتا خۆر هەڵاتن ئەوا پێم خۆشترە لەوەی چوار لەمنداڵەكانی ئیسماعیل ئازاد بكەم، هەروەها ئەگەر هاونیشینی كەسانێك بم كە هەر لەنوێژی عەسرەوە تاكوو خۆر ئاوابوون خەریكی یادی خوای گەورە بن پێم خۆشترە لەوەی چوار لەو منداڵانە ئازاد بكەم).عن أنس يرفعه أبو داود برقم ٣٦٦٧، وحسنة الألباني، صحيح أبو داود ٢/٦٩٨ .

ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ (البقرة)[1] . لەپێشتر تەفسیر کراوە.

٢/٧٦- بسم الله الرحمن الرحيم ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ

(١) سورة البقرة اية ٢٥٥، ( هەرکەسێك کاتێ بەیانی کردەوە ئەمە بڵێ ئەوا تاکوو ئێوارە دەکاتەوە لەجنۆکەکان پارێزراو دەبێ و، هەروەها هەرکەسێکیش کاتێ ئێوارەی کردەوە بیخوێنێ ئەوا هەتا بەیانی دەکاتەوە لێیان پارێزراو دەبێ)، أخرجه الحاكم ١/٥٦٢ وصححة الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ١/٢٧٣ وعزاه الى النسائي والطبراني وقال : إسناد الطبراني جيد .

ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ﴿٣﴾ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴿٤﴾ ﴾ (سورة الأخلاص) لەپێشتر تەفسیر کراوە

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّـٰثَـٰتِ فِى ٱلۡعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾ (سورة الفلق) لەپێشتر تەفسیر کراوە

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَـٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسۡوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾ (سورة الناس) لەپێشتر تەفسیر کراوە

**ئەم سێ سورەتە هەریەکی سێ جار دەخوێنی[1] .**

---

(١) هەرکەسێ لەکاتێ بەیانی‌و ئێوارە دادێ سێ جار ئەم سورەتانە بخوێنێ ئەوا دربارەی هەموشتێکی بەسە. اخرجه ابو داود ٤/٣٢٢ والترمذي٥/٥٦٧ وانظر: صحيح الترمذي٣/١٨٢.

٣/٧٧- (أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لله (١) وَالْحَمْدُ لله، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، رِبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ ما في هَذَا اليومِ وَخَيْرَ مَا بَعْدَهُ (٢) وأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي هَذَا الْيَوْمِ وَ شَرِّ مَا بَعْدَهُ رِبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الكَسَلِ، وَسُوءِ الكِبَرِ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ وَعذابٍ فِي الْقَبْرِ)[٣] .

**واتە : ئێمە بەیانیمان کردەوە، هەموو موڵك و ماڵ و دەسەڵاتێك هی خوایە، سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە،**

---

(١) وإذا أمسى قال : أمسينا وأمسى الملك لله .

واتە: ئەگەر ئێوارەی کردەوە دەڵێ: ( ئێمە ئێوارەمان کردەوەو، هەموو موڵكو دەسەڵاتیش هەر لەبۆ خودایە)

(٢) وإذا أمسى قال : رب أسألك خير ما في هذه الليلة وخير ما بعدها وأعوذبك من شر ما في هذه الليلة وشر ما بعدها.

واتە: ( ئەگەر ئێوارەی کردەوە دەڵێ: خوایە داوای خێرو چاکەی ئەو شەوەو دوای ئەو شەوەت لێ دەکەمو خۆشم بەتۆ دەپارێزم لەشەر و خراپەی ئەو شەوەو ئەوەی دوای ئەو شەوە).

(٣) مسلم ٢٠٨٨/٤

**هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی کە (الله)یەو تاك و تەنیایە، هیچ شەریك و هاوبەشێکی نیە، سوپاس و ستایش و تواناو دەسەلآت و پادشایەتی بۆ ئەو خوایەی کە بەسەر هەموو شتەکانی ژیان و بوونەوەردا زاڵ و توانادارە، خوایە داوای خێرو چاکەی ئەو ڕۆژەو دوای ئەم ڕۆژەشت لێ دەکەم، خۆم بەتۆ لە هەموو زەرەرو زیان و خراپەی ئەمڕۆو دواتری دەپارێزم، خوایە خۆم بەتۆ لە سستی و تەمبەلی و پیربەدی و سزاو ئازاری ناو ئاگرو ناو گۆڕ دەپارێزم .**

٤/٧٨- (اللهمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ أَمْسَيْنَا(١) وبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ)(٢) .

---

(١) وَإِذَا أمسى قال : اللهمَّ بِكَ أمسينا وبِكَ أصبَحْنا وبك نحيا وبك نموت وإليك المصير.

واتە: ( ئەگەر ئێوارەشی کردەوە دەڵێ: خوایە ئێمە بەهۆی تۆوەوە شەومان کردەوەو، بەهۆی تۆوەش بەیانیمان کردەوەو، بەهۆی تۆوە دەژینو بەهۆی تۆوەش دەمرینو هەربۆلای تۆش دەگەڕێینەوە).

(٢) الترمذي ٤٦٦/٥، وانظر، صحيح الترمذي ١٤٢/٣ .

**<u>واته</u> :** **خوایه بەهۆی تۆوه بەیانی و ڕۆژمان کردەوه، بەهۆی تۆوه ئێوارەو شەومان کردەوه، خوایه بەهۆی تۆوه دەژین و دەمرین، دەگەڕێینەوه لای تۆ بۆ زیندوکردنەوەو لێپرسینەوەمان لە کارو کردەوەکانی ڕابردووی ژیانمان .**

**٧٩/٥-** (اللهمَّ أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَه إلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُبِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ [١] لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ بِذَنْبِي فَاغْفِر لِي فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ)[٢] .

**<u>واته</u> :** **خوایه تۆ پەروەردگاری منی، جگە لەتۆ هیچ خوایەکی بەهەق و ڕاست و شایستەی پەرستن نیه، تۆ منت**

---

(١) أقر وأعترف .

(٢)( هەرکەسێ کاتێ ئێوارەی کردەوه ئەمە بلێ بڕواو یەقینی پێ هەبێ ئەگەر لەم شەوەی دا بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە، بەهەمان شێوەش ئەگەر بەیانی کردەوە).أخرجه البخاري ٧/ ١٥٠ .

دروستکردووەو ژیانت پێداوم، من بەندەی تۆم، لەسەر ئەو بەڵێن و پەیمانەم کە پێم داوی بەپێی توانا نەیشکێنم، خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لەو زەرەرو زیان و خراپانەی کە تۆ دروستت کردووە، دان بەو نازو نیعمەت و چاکانە دێنم کەلەسەر منت کردووەو، لە گوناه و تاوانەکانم دەگەڕێمەوە لای تۆ، بۆ لای تۆ پەشیمان دەبمەوە، دان بەهەڵەو تاوانەکانم دەنێم و لێیان پەشیمانم، دە کەواتە لێم خۆشبە، چونکە جگە لەتۆ کەس تواناو دەسەڵاتی لێبوردن و لێخۆشبوونی لە گوناه و تاوانەکان نیە.

٦/٨٠- (اللهمَّ إِنِّي أَصْبَحْتُ [١] أُشْهِدُكَ أُشهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ، وَمَلَائِكَتَكَ وَجَمِيعَ خَلْقِكَ، أَنَّكَ أَنْتَ اللهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ وَحْدَكَ

---

(١) وإذا أمسى قال : اللهم إني أمسيت .

واتە: ( ئەگەر ئێوارەی کردەوە دەڵێ: خوایە من شەوم کردەوە..)

لاَ شَرِيكَ لَكَ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ) **(چوار جار)** [١].

**<u>واته</u> : چوار جار دەڵێ : خوایە بەهۆی تۆوە ڕۆژو بەیانیم کردەوەو هەم، خوایە من و سەرجەم خەڵك و دروستکراو و فریشتەکان و هەڵگرانی تەخت و بارەگات گەواهی دەدەن کە تۆ ئەو خوا (اللە)یەی کە جگە لە تۆ هیچ خوایەکی بەهەق و ڕاست نیە، تۆ تاك و تەنیاو بێ شەریك و هاوەڵی لە دروستکردن و بەڕێوەبردندا، گەواهی دەدەین کە موحەممەد ﷺ بەندەو پەیامبەری تۆیە .**

٨١/٧- (اللهمَّ مَا أَصْبَحَ بِي [٢] مَنْ نِعْمَةٍ أَوْ بَأَحَدٍ مِنْ خَلْقِكَ

---

(١)( هەرکەسێك کاتێ بەیانی کردەوە یاخود ئێوارەی کردەوە چوار جاران ئەمە بڵێ ئەوا خوای گەورە لەئاگری دۆزەخ ئازادی دەکات). أخرجه أبو داود ٣١٧/٤ والبخاری في الأدب المفرد برقم ١٢٠١ والنسائی في عمل اليوم الليلة برقم ٩، وابن السني برقم ٧٠ وحسن سماحة الشيخ ابن باز إسناد النسائی وأبي داود في تحفة الأخيار ص ٢٣ .

(٢) وإذا أمسى قال : اللهم ما أمسى بي . . . . . .

واتە: (ئەگەر ئێوارەی کردەوە دەڵێ: ( خوایە هەرچی لەو ئێوارەیە....)

فَمِنْكَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ، فَلَكَ الْحَمْدُ وَلَكَ الشُّكْرُ)[1] .

**واتە : خوایە هەرنازو نیعمەت و خێرو چاکەیەك کەتۆ لەم بەیانییە بەمنت داوە، یا بەیەکێك لە دروستکراوەکانی خۆت بەمن داوە، تەنها لەلای تۆی تاك و تەنیایە، تۆ هیچ هاوەڵێکت نیە، خوایە سوپاس و ڕێزو پێزانین هەر بۆ تۆیە.**

**٨/٨٢-** (اللهمَّ عَافِنِي فِي بَدَنِي ــ اللهمَّ عَافِنِي فِي سَمْعِي، اللهمَّ عَافِنِي فِي بَصَرِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الكُفْرِ، وَالْفَقْرِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ) **(سێ جار)**[2].

---

(١) هەرکەسێك کاتێ بەیانی کردەوە سێ جاران ئەمە بڵێ ئەوا سوپاسگوزاری ئەو ڕۆژەی بەجێهێناوەو، هەروەها ئەگەر ئێوارەی کردەوە بیڵێ ئەوا سوپاسگوزاری ئەو شەوەی بەجێهێناوە.أخرجه أبو داود ٣١٨/٤، والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم ٧ وابن السني برقم ٤١ وابن حبان (موارد) ٢٣٦١ وحسن ابن باز إسناده في تحفة الأخيار ص ٢٤ .

(٢) أبو داود ٣٢٤/٤، وأحمد ٤٢/٥ والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم ٢٢ وابن السني برقم ٦٩ والبخاري في الأدب المفرد وحسن العلامة ابن باز إسناده في تحفة الأخيار ص ٢٦ .

**واتــه** : ســێ جــار دەڵــێ : خوایــە لاشــەم چــاك و ســاغ و سەلامەت و تەندروست باش بکە، خوایە بیستن و گوێم چاك و باش و ساغ و سەلامەت بکە، خوایە چاو و بینینم چــاك و سەلامەت بکە، خوایە جگە لــە تــۆ (الله) هــیچ خوایــەکی هەق و شایستە نیە، خوایە بەتۆ خۆم دەپارێزم لە هــەژاری و بێ باوەڕی و سزاو ئازاری ناو گۆڕ، خوایــە جگــە لــەتۆ هــیچ خوایەکی تری بەهەق و شایستەی پەرستن نیە.

**٨٣/٩-** (حَسْبِـــيَ اللهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُـــوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيم) (سَبْعَ مرَّاتٍ)[1].

**واتە** : ئەو خوایەم بەسە کە (الله)یە، تاك و تەنیایەو جگــە لەو هیچ خوایەکی تر نیە، پشت بەو دەبەســتم، ئــەو خوایــە

(١)( هەرکەسێك کاتێ بەیانی و ئێوارەی کردەوە حەوت جاران ئەمە بڵێ ئەوا خوای گەورە لەکاروباری دونیــاو ڕۆژی دوایــی کــەپێوەی ســەرقاڵ بــووەو خەمی لێ دەخوات ڕزگاری دەکات. أخرجه ابن الســني برقم، ٧١ مرفوعاً وأبو داود موقوفاً ٣٢١/٤، وصحيح شعيب وعبدالقادر الأرنــاؤوط . انظر، : زاد المعاد ٣٧٦/٢ .

پەروەردگاری تەخت و بارەگای گەورەو بالاّیە، (٧)جار ئەوە دەڵێت .

٨٤/١٠- (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالاخِرَةِ، اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ، فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي، وَمَالِي، اللهمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي، وَآمِنْ رَوْعَاتِي، اللهمَّ احْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ شِمَالِي، وَمِنْ فَوقِي، وَأَعُوذُبِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي)[1] .

واتە : خوایە من لە دونیاو دوارۆژدا داوای خێرو چاکەو ساغی و سەلامەتی و لێبوردن و لێخۆشبوونت لیّ دەکەم، خوایە لەبارەی دین و دونیاو سەروەت و سامان و خانەوادەکەم، داوای خێرو خۆشی و ساغی و سەلامەتیت لیّ دەکەم، خوایە عەیب و عارم داپۆشە، خوایە لەترس و تۆقین بمپارێزە، خوایە لەوەم بپارێزە کە لەنێوان دەستەکانم دایەو دیارە، لەوەی کە لەدواوەمەو نادیارە لەوەی کە لە دەستە ڕاست و لەپێشەوەمە، لەوەی کە لەچەپ و لەدواوەمە لەوەی

(١) أبو داود و ابن ماجه وانظر، صحيح ابن ماجه ٢/٣٣٢ .

**کـه لەسـەرومەو بەسـەرمدا زاڵـە، خوایـە بەگـەورەیی و دەسەڵاتی تۆ خۆم لەوە دەپـارێزم کـە لـەژێرەوەو بـە نهێنـی ڕەشەکوژو تیرۆر بکرێم و فرو فێڵ و ستەمم لەگەڵدا بکرێت.**

٨٥/١١- (اللهمَّ عَالمَ الْغَيب وَالْـشَهَادَة فَـاطِرَ الـسَّموات وَالأَرْضِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْـتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي، وَمِنْ شَرِّ الـشَّيْطَانِ وَشِـرْكِهِ، وَأَنْ أَقْتَرِفَ عَلَى نَفْسِي سُوءًا، أَوْ أَجُرَّهُ إِلى مُسْلِمٍ)[١].

**واتە : ئەی خوای پەنهان و ئاشکراکان، دروستکەری ئـەرزو ئاسمانەکان، پەروەردگارو پاشای هەموو شتێکی لەبوونـەوەر، گەواهی دەدەم کە جگە لەتۆ هـیچ خوایـەکی بەهـەق و ڕەوا نیە، خۆم بەتۆ لە خراپەی دڵ و دەروونم و لـە زەرەرو زیـان و خراپەی شەیتانی بەدو هاوەڵدانانی دەپارێزم، وە خۆم دەپارێزم لەوەی کە بۆخۆم هـیچ گونـاه و تاوانێـك لـەخۆم بنـالێنم و ئەنجامی بدەم، یا بیبەمـە سـەر هـیچ موسـڵمانێك و تێیـوە بگلێنم .**

---

(١) الترمذی و أبو داود وانظر، : صحيح الترمذی ١٤٢/٣ .

١٢/٨٦- (بِسْمِ للهِ الَّذي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِه شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّميعُ الْعَليمُ) (سێ جار)[1].

**واتە : بەناوی ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئەرزو ئاسمانە لەگەڵ ناوی خوا هیچ زەرەرو زیانێکی نابێت، ئەو خوایەی کە زۆر بیسەرو زانایە . (سێ جار دەگوترێت) .**

١٣/٨٧- (رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ نَبِيّاً) (سێ جار)[2] .

---

(١) هەرکەسێك کاتێ بەیانی کردەوەو کاتێ ئێواردی کردەوە سێ جاران ئەمە بڵێ ئەوا هیچ شتێك زیانی پێناگەیەنێت. أخرجه أبو داود ٤/٣٢٣ والترمذي ٥/٤٦٥ وابن ماجه وأحمد . انظر : صحيح ابن ماجه ٢/٣٣٢وحسن إسناده العلامة ابن باز في تحفة الأخيار، ص ٣٩ .

(٢) (هەر کەسێك کاتێ بەیانی کردەوە سێ جاران و کاتێکیش ئێوارەی کردەوە سێ جاران ئەمەبڵێ ئەوا مافە لەسەر خودای گەورە لەرۆژی قیامەتدا رازی بکات.، أحمد ٤/٣٣٧ والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم ٤ وابن السني برقم ٦٨ وأبو داود ٤/٣١٨ والترمذي ٥/٤٦٥ وحسنة ابن باز في تحفة الأخيار ص ٣٩ .

**واتە** : ڕازیم خوا (الله) پەروەردگارم بێ، ئیسلام ئایینی ژیانم بێ، موحەممەد پێغەمبەر ﷺ پێشەوام بێ. ( سێ جار دەگوترێت) .

٨٨/١٤- ( يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ أَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ وَلاَ تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ)[1] .

**واتە** : ئەی خوای هەمیشە زیندوو ڕاگری کایەو بوونەوەر، بەڕەحمەتی تۆ پەنا دەگرم و داوای کۆمەکی و هاوکاری و فریا خوازیت لێ دەکەم، خوایە هەموو کارو بارەکانی ژیانم چاك و ساز بکە، خوایە بۆ چاو تروکانێك و برە ژیانێك شتێکم لەسەر نەکەیتە بارو دەردو بەلاّ، نەم دەیتە دەست نەفسی بەدی خۆم، چونکە نەفسم کاری خراپ و ناشەرعیم پێ دەکات، زەرەرو زیان لە دونیاو دوارۆژم دەدات .

(١) الحاكم وصححه و وافقه الذهبي ٥٤٥/١ وانظر، صحيح الترغيب والترهيب ٢٧٣/١ .

٨٩/١٥- (أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ [(١)]، اللــــهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذَا الْيَوْمِ [(٢)]، فَتْحَهُ، وَنَصْرَهُ وَنُورَهُ، وَبَرَكَتَــهُ، وَهُداهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ما فيهِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهُ [(٣)] .

**واته : خوایه ئێمــه بــه‌یانی و ڕۆژمــان کــردەوەو بــووین، وه هــه‌موو مولــك و ده‌ســه‌لاتێکیش کــه بــووه، هــی خــوای په‌روه‌ردگاری جیهانیانــه، خوایــه مــن داوای خێــرو چــاکه‌ی**

---

(١) وإذا أمســى قال : أمســينا وأمســى الملك لله رب العالمين .

واته: کاتێکیش ئێواره‌ی کرده‌وه ده‌ڵێ: ( امســينا وامسى الملك لله رب العالمين).

واته: ئێمه ئێوارەمان کرده‌وه‌و،هه‌موومولکو ده‌سه‌لاتێکیش هه‌ر هی خوای په‌روه‌ردگاری جیهانیــانه.

(٢) وَإذا أمســى قال : اللهمَّ إني أسألك خير هذه الليلة فتحها ونصرها ونورها وبركتها وهداها وأعوذبك من شر ما فيها وشر ما بعدها .

واته: خوایه من داوای خێرو چاکه‌ی ئه‌و شه‌وه‌ت لێ ده‌که‌م له‌کرانه‌وه‌و سه‌رکه‌وتن‌و روناکی‌و فه‌رو رێنماییه‌که‌ی‌و خۆشم هه‌ر به‌تۆ ده‌پارێزم له هه‌رچی شه‌ڕو خراپه‌یه‌ك که‌له‌و شه‌وه‌و له دوای ئه‌وشه‌وه دا هه‌یه.

(٣) أبو داود ٣٢٢/٤ وحســن إسناده شعيب وعبد القادر الأرناؤوط في تحقيــق زاد المعاد ٣٧٣/٢ .

ئـــەورۆت لێ دەكـــەم، لەكرانـــەوەو ســــەركەوتن رونـــاكیو بەرەكەتیو رێنماییەكـەی، وەخـۆم بـەتۆ دەپـارێزم لەهــەمو زەرەرو زیان و خراپەیەك كەلەمرۆژەدایەو لە دوایەتی .

٩٠/١٦- (أَصْبَحْنَا عَلَى فِطْرَةِ الإِسْلاَمِ (١)، وَعَلَــى كَلِمَـــةِ الإِخْلاَصِ، وَعَلَى دِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍﷺ، وَعَلَى مِلَّةِ أَبِينَا إِبْرَاهِيمَ، حَنِيفاً مُسْلِماً وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ)[٢] .

واتە : خوایە ئێمە بەیانی و ڕۆژمان كردەوە لەسەر پـاكی و سروشتی ئیسلام، لەسەر وتەی پاك و پیرۆزو دڵسۆز، لەســەر ئایینی موحەممەدی پێغەمبــەرمان ﷺ، وە لەســەر ڕێبـازی میللەتی ئیبراهیمی باوكمان، بە پـاكی و بـێ گـەردی و بــە موســڵمانێتی ڕۆژمــان كـردەوە، مــن موشـریك و هاوبــەش

---

(١) وإذا أمـــى قال : أمـــينا على فطرة الأسلام .

كاتێكیش ئێوارەی كردەوە دەڵێ: ( أمسينا على فطرة الاسلام).

واتە: لەسەر فیترەتو فرچكی ئیسلام ئێوارەمان كردەوە.

(٢) أحمد ٤٠٦/٣ و ٤٠٧ وابن السنى في عمل اليوم والليلة برقم ٣٤ وانظر، : صحيح الجامع ٢٠٩/٤ .

پەیداکەر نیم، وەك ئەوانەی کەشەریك و هاوەڵ بۆ تۆ بڕیار دەدەن.

٩١/١٧- ((سُبْحانَ الله وَبِحَمْدِهِ)) (مِائَةَ مَرَّةً)[١].

**واتە** : (١٠٠)جار دەڵێـی : پـاکی و بێگـەردی بـۆ خوایـە سوپاس و ستایش بۆ خوایە .

٩٢/١٨- (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْـكُ وَلَـهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) عَشْرَ مَرَّات (٢) أوْ (مَـرَّةً وَاحِدَةً عِنْدَ الْكَسَلِ)[٣] .

---

(١) هەر کەسێك کاتێـك بـەیانیو ئێـوارەی کـردەوە سـەد جـاران ئەمـەبڵێ، لەرۆژی قیامەتدا کەس نییـە شـتێکی چـاکتری لەوکەسـە لەگـەڵ خـۆی هێنابێ مەگەر یەکێ: وەکو ئەوی گوتبێ یاخود لەوی زیاتر گوتبێ.مسلم ٢٠٧١/٤ .

(٢) النسـائي في عمل اليوم والليلة برقم ٢٤وانظر، : صـحيح الترغيـب والترهيـب ٢٧٢/١، وتحفة الأخيـار ابن باز ص ٤٤ و انظر، فضلها في ص ١٤٦، حديث رقم ٢٥٥ .

(٣) أبـو داود ٣١٩/٤ وابـن ماجـه وأحمـد ٦٠/٤ وانظـر، : صـحيح الترغيـب والترهيب ٢٧٠/١، وصحيح أبو داود ٩٥٧/٣، وصحيح ابن ماجه ٣٣١/٢ وزاد المعاد ٣٧٧/٢ .

**واتە** : هیچ خوایەك نیە جگە لەخوا (الله) نەبێ تاك و تەنیایە، هیچ شەریك و هاوەڵێكی نیە لە ژیان و بەڕێوەبردندا، هەموو موڵك و دەسەڵات و سوپاس و ستایشێك بۆ ئەوە، وە لەسەر هەموو شتەكانی ژیان و بوونەوەریش پەیدارو تواناداره، (١٠)جار دەگوترێ، یان لەكاتی هەر بێتاقەتیەك جارێك دەگوترێت .

١٩/٩٣- (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) مِائَةَ مَرَّةٍ إِذَا أَصْبَحَ[1] .

**واتە** : هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله)، ئەو خوایەی كە تاك و تەنیایە، هیچ شەریك و هاوەڵێكی نیە، هەموو موڵك و دەسەڵات و سوپاس و ستایشێك هەر بۆ ئەوە و لەسەر

---

(١) هەركەسێك لەرۆژێكدا سەد جاران ئەمە بڵێ، وەكوو ئەوە وایە كە دەبەندەی ئازاد كردبێ‌و هەروەها سەد چاكەشی بۆ دەنووسرێ‌و سەد گوناهیشی لەسەر رەش دەكرێتەوە، ئەم رۆژەشی هەتا ئێوارە دەكاتەوە لە شەیتان پارێزراو دەبێ‌و، لەرۆژی دواییشدا كەس لەو باشتر لەگەڵ خۆی ناهێنێ مەگەر یەكێك بێ كە لەو زیاتری گوتبێ. البخاري ٩٥/٤، ومسلم ٢٠٧١/٤ .

**هەموو شتەکانی ژیان زۆر تواناداره، (کاتێ بەیانی بوویەوە سەد جار ئەوە دەگوترێت) .**

٢٠/٩٤- (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ) ثَلاَثَ مَرَّاتٍ إِذَا أَصْبَحَ)[١] .

**واتە : بە سوپاس و ستایش خوا پاکی و بێگەردی بۆ خوای گەورە بەقەد ژمارەی دروستکراوەکان و ڕەزامەندی خۆی و بەقەد کێش و گرانی تەخت و بارەگای خۆت و بەقەد زۆری و فراوانی وشەکانی ((کاتێ بەیانی بۆوە سێ جار دەگوترێ)).**

٢١/٩٥- ﴿اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْماً نَافِعاً، وَرِزْقاً طَيِّباً، وَعَمَلاً مُتَقَبَّلاً (إِذَا أَصْبَحَ) ﴾[٢] .

**واتە : خوایە من داوای زانست و زانیاریەکی فرە بەسوودو ڕزق و ڕۆزیەکی زۆر پاك و بێگەردو حەلاڵ و فراوان و کارو کردەوەیەکی چاك و وەرگیراوت لێ دەکەم، (کاتێ بەیانی بۆوە**

---

(١) مسلم ٤/٢٠٩٠ .

(٢) أخرجه السني في عمل اليوم والليلة برقم ٥٤ وابن ماجه برقم ٩٢٥ وحسن إسناده عبدالقادر وشعيب الأرنازوط تحقيق زاد المعاد ٢/٣٧٥ .

دەگوترێ ).

٢٢/٩٦- ﴿أَسْتَغْفِرُ اللهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ﴾ (مِائَةَ مرَّةٍ فِي الْيَوْمِ) [١] .

واته : خوایه لە گوناه و تاوانەکانم خۆش بە، گەڕامەوە لای تۆ، پەشیمانم لە گوناه و تاوانەکانم، (لە ڕۆژێکدا سەد جار دەگوترێ).

٢٣/٩٧- ﴿أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ﴾ (ثَلاَثَ مَرَّاتٍ إِذَا أَمْسَى) [٢] .

واته : خۆم دەپارێزم بە وشە بەرزو بەڕێزو تێرو تەواوەکانی خوای کردگار، لە زەرەرو زیان و خراپەی هەرچی خوا دروستی کردووە (کاتی ئێوارە داهات (٣)جار دەگوترێ) .

٢٤/٩٨- ﴿اللهمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ﴾ (عَشْرَ

(١) البخاري مع الفتح ١٠١/١١، ومسلم ٢٠٧٥/٤ .

(٢)هەر کەسێك کاتێ ئێوارەی کردەوە سێ جاران ئەمە بڵێ، هیچ شتێك لەم شەوەدا زیانی پێ ناگەیەنێت. أخرجه أحمد ٢٩٠/٢، والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم ٥٩٠ وابن السني برقم ٦٨ وانظر، : صحيح الترمذي ١٨٧/٣ وصحيح ابن ماجه ٢٦٦/٢ وتحفة الأخيار ص ٤٥ .

مَرَّاتٍ)[1] .

**واتە** : خوایە درورودو سەلام و بەرەکەتی بێشومار بڕژێنە سەر موحەممەدی پێغەمبەرمان ﷺ، دە جار ئەوە دەگوترێ .

## ٢٨- زیکرەکانی کاتی خەوتن

١/٩٩- (يَجْمَعُ كَفَّيْهِ ثُمَّ يَنْفُثُ فِيهِمَا فَيَقْرَأُ فِيهِمَا: بسم الله الرحمن الرحيم ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤﴾(سورة ألاخلاص)،

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ۝٣ وَمِن شَرِّ

(١) هەرکەسێك بەیانیان دە سەلاواتم لەسەر لێ بدات، رۆژی دوایی شەفاعەتم فریای دەکەوێت أخرجه الطبراني باسنادين أحدهما جيد، انظر، : مجمع الزوائد ١٠/١٢٠ وصحيح الترغيب والترهيب ١/٢٧٣.

ٱلنَّفَّـٰثَـٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾(سورة الفلق) لەپێشتر تەفسیر کراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَـٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾ (سوره الناس). لەپێشتر تەفسیرکراوە

ثُمَّ يَمْسَحُ بهمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ يَبْدَأُ بِهمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ) يَفْعَلُ ذلِكَ ثلاثَ مَرَّاتٍ[1].

سوننەتە ئینسان لەکاتی خەوتن لەسەر جێگای ڕاکشانی هەر دوو دەستەکانی وێك بێنێتەوە وەکو مشتێکی لیّ بکاو بەزار فوویان پێدابکا، ئەم سوڕەتانەی تێدا بخوێنیتەوە (٣جار) دەستەکانی بەسەر روخسارو لەشیدا دەهێنێت. لەسەرو روخساریەوە دەست پێدەکات ئینجا ئەوانی دیکە.

(١) البخاري مع الفتح ٩/٦٢ ومسلم ٤/١٧٢٣ .

٢/١٠٠- ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ٢٥٥﴾ (سورة البقرة)

لەپێشتر تەفسیر کراوە.[1]

٣/١٠١- ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا

---

(١) من قرأها إذا أوى إلى فراشه فإنه لن يزال عليه من الله حافظ ولا يقربه شيطان حتى يصبح، البخاري مع الفتح ٤٨٧/٤.

واتە: هەرکەسێك کاتێ کە دەچێتە نێو جێگەی نوستنی ئەم ئایەتە بخوێنێ ئەوا بەردەوام خوای گەورە دەیپارێزێ‌و هەتا بەیانیش دەکاتەوە شەیتان لێی نزیك نابێتەوە.

وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ ﴾ (البقرة)[1].

**<u>واتــه</u> : ســەرەتای هــاتنی ئیــسلام و دابــەزینی قورئــان، پێغەمبەر ﷺ بڕوای بەو قورئانە هێنا کـە لەلایـەن خـواوە بۆی دابەزیوە، وە دواتر هەموو ئیمانداران بە تێکـڕا بڕوایـان بـەخوا فریـشەکانی و بـە پەرتووکـە دابـەزیوەکانی و بـە پێغەمبەرە ڕەوانەکراوەکانی هێنا، دەبـێ بـڕوادار بیروبـاوەڕی**

(١) من قرأهما في ليلة كفتاه، البخاري مع الفتح ٩/٩٤ ومسلم ١/٥٥٤، والآيتان من سورة البقرة ٢٨٥-٢٨٦ .

واتە: هەرکەسێك لەشەوێك دا ئەمانە بخوێنێ پێویستی بەهیچی تر نابێ.

وابێ و بڵێ : خوایە ئێمە لـە بـڕوا هێنانمـان هـیچ فـەرق و جیاوازیەك ناكەین لەنێوان پێغەمبەرانی تۆ، كەواتە بڕوامان بەهەموویانە، كـە پێغەمبـەرو ڕەوانـەكراوی خـوان، وەدوای ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ پەیامە پیرۆزەكەی خوای كردگـاری بـە بـڕواداران ڕاگەیانـد، ئـەوانیش گوتیـان، ئـەی خـوای پەروەردگار ، وا ئێمە گوێمان لەم پەیامـە بـوو، پـەیڕەویمان كرد، دەتۆش لێمان خۆش ببە، چونكە چارەنووس و گەڕانـەوە هەر بۆ لای تۆیە، خوای گەورە زیاد لە توانـاو پێویـست داوا لە هیچ خودو كەسێك ناكا، كارو عیبادەتێـك بكـا كـە لـە توانایدا نەبێ، بۆیە هەرچی چاكە ئەگەر بیكا بۆ خۆیـەتی، وە هەرچی خراپەیە ئەگەر بیكا ئەوە لەسـەر خۆیـەتی و لـە ڕۆژی دوایی پێی سزاو ئـازار دەدرێ و دێتـەوە ڕێـی، خوایـە لێمان مەگرە ئەگـەر كـارو كردەوەیـەكی خراپمـان بەهەڵـەو بەلەبیرچوون كرد، یانەمان زانی كە ئـەوە یاسـاغ و حـەرام و گوناهە، بە گوناه و تاوانمان لەسەر مەنووسە، بارو ئەركمان قورس مەكە بەو شێوەی كە خستتە سەر شان و باڵی ئەوانەی

پێش ئێمەو ئەرك و بارت گران كردن، شتێكمان لەسەر دامەنێ و بە دەردو بەلایەكمان تاقی مەكەوە كە لەتواناو دەسەلات و ئیمان و خۆڕاگریمان دانەبێ، خوایە لێمان ببورەو، لێمان خۆشبەو ڕەحمان پێ بكە، خوایە هەر تۆ تاكە پشت و پەناو ڕاگرمانی، دەبەسەر خەلكی بێ باوەڕدا سەرمان بخەو زالمان بكەو هاوكاریمان بكە.

٤/١٠٢- ﴿بِاسْمِكَ [١] رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِي، وَبِكَ أَرْفَعُهُ فَإِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا، بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ﴾[٢] .

---

(١) ( إذا قام أحدكم من فراشه ثم رجع إليه فلينفضه بصنفة إزاره ثلاث مرات وليسم الله فأنه لا يدري ما خلفه عليه بعده وإذا اضطجع فليقل ..) الحديث.

واتە: (هەركەسێك لەئێوە كاتێك لەنێو جێو بالینگانی خۆی هەلسا و پاشان بۆی گەڕایەوە، بابەلچكی كەواكەی سێ جاران جێگاكەی بتەكێنێ و ناوی خودابێنێ چونكە ئەو نازانێ لەدوای جێهێشتنی چی هاتۆتە سەر، ئەگەریش لەسەری پالكەوت بابلێ...) فەرموودەكە.

(٢) البخاري ١١/١٢٦، ومسلم ٤/٢٠٨٤ .

**واته** : ئەی پەروەردگار بەناوی تۆ تەنیشتم لەسەر جێ و زەوی دانا، بەناوی تۆوە هەڵی دەگرم و بەرزی دەکەمەوە لەسەر جێ، ئەگەر گیانی منت کێشار بۆخۆت بردەوە، رەحمم پێ بکە، وە ئەگەر وێتدامەوەو ناردتەوەو ئازادت کرد، بۆمی بپارێزە لە گوناه و تاوان و دەردو بەلاّ، بەوەی کە بەندە چاکەکانی خۆت پێی دەپارێزی .

٥/١٠٣- ﴿اللهمَّ إِنَّكَ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا، لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا، إنْ أَحْيَيْتَهَا فَا حْفَظْهَا، وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا، اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ﴾ (١) .

**واته** : خوایە گیان بەڕاستی تۆ خودی منت دروستکردووە، هەر تۆش دەیمرێنی، خوایە مردن و ژینم هەر بەدەست تۆیە، ئەگەر دەیژیێنی بیپارێزەو ئاگاداری بە، ئەگەر مراندت ئەوا لێی خۆشبە، خوایە داوای خێرو خۆشی و ساغ و سەلامەتی و تەندروستی باشت لێ دەکەم .

---

(١) أخرجه مسلم ٢٠٨٣/٤ وأحمد بلفظه ٧٩/٢ .

١٠٤/٦- ﴿اللهمَّ قِني [1] عَذَابَكَ يَوْمَ تبْعَثُ عِبادَكَ﴾[2] .

**واته :** خوایه له سزاو دۆزەخ و ئازاری خۆت بمپارێزە ئەو ڕۆژەی کە بەندەکانی خۆت زیندوو دەکەیتەوە .

١٠٥/٧- ﴿باسْمِكَ اللهمَّ أَمُوتُ وأَحْيَا﴾ [3] .

**واته :** خوایه بەناوی تۆوە دەمرم و دەژیمەوەو لەخەو زیندوو دەبمەوە .

١٠٦/٨- ﴿سُبْحَانَ اللهِ (ثَلاَثاً وَثَلاثِينَ) [4] وَالْحَمْدُ للهِ (ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ) واللهُ أَكْبَرُ (أَرْبَعاً وَ ثَلاثِينَ) .

**واته :** (٣٣) جار دەڵێ : پاکی و بێگەردی بۆتۆ،(٣٣) جار دەڵێ سوپاس و ستایش بۆ تۆ، (٣٤)جار دەڵێ : خوا هەرە گەورەیە، خوا لەهەموو شتێك گەورەترە .

---

(١) (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بویستبا لەسەر جێگاکەی پاڵکەوێ، دەستی ڕاستەی دەخستە ژێر ڕوومەتی خۆیو پاشان دەیفەرموو..)فەرموودەکە

(٢) أبو داود بلفظه ٣١١/٤ وانظر، صحيح الترمذی ١٤٣/٣ .

(٣) البخاري مع الفتح ١١٣/١١ ومسلم ٢٠٨٣/٤ .

(٤)(هەر کەسێك کاتی چوونە نێو جێگەی خەوتنی ئاوا بڵێ ئەوا لەخزمەتکاربۆی باشترە.) البخاري مع الفتح ٧١/٧ ومسلم ٢٠٩١/٤ .

٩/١٠٧- ﴿اللهمَّ رَبَّ السَّموات السَّبْع وَرَبَّ الأَرْضِ وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْء، فالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجيلِ، والْفُرْقَان، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخذٌ بنَا صيَته، اللهمَّ أَنتَ الأَوَّلُ فلَيسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنتَ الآخرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهرُ فَلَيْس فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ اقْضِ عَنَّا الدَّيْنِ واَغْننا مِنْ الْفَقْرِ﴾[1] .

**واته : ئەی خوای پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و زەوی، پەروەردگاری تەخت و بارەگای گەورەو گوشاد ، پەروەردگارمان پەروەردگاری هەموو شتێکی بوونەوەرە، دروستکەری دەنك و ناوك و ئەوەی کە تیایەتی، دابەزێنەری تەوارت و ئینجیل و فورقان (لێك جیاکەرەوەی هەق وناهەق) ، خوایە خۆم دەپارێزم بەتۆ لەهەموو خراپەیەکی ژیان، خوایە چارەنووس و نێو چەوانی من بەدەست تۆیەو**

(١) مسلم ٢٠٨٤/٤ .

لەلای تۆیە، خوایە هەر تۆ یەکەمی و هیچ شتێك پێش تۆ لە بوون نەبووەو نیە، خوایە تۆ کۆتا ودوماهی و، هیچ شتێك لەدوای تۆ نیە و ناژی و نامێنیٚ، تۆ دیارو ئاشکرایی و لەسەر ووی لەو دیوی تۆ هیچ شتێکی تر نیە، خوایە تۆ خوایەکی پەنهانی و نادیاری وەکو خودی خۆت، جگە لەتۆو لە خوارە تۆ هیچ خوایەکی تری بەهەق و ڕەوا نیە، خوایە قەرزمان لەجیاتی ئێمە بۆ جێ بەجێ بکەوەو، لەهەژاری ڕزگارمان بکە .

١٠٨/١٠- ﴿الْحَمْدُ للهِ الَّذي أَطْعَمَنَا وَسقَانَا، وَكَفَانَا، وَآوانا، فَكَمْ مِمَّنْ لا كَافِيَ لَهُ وَلاَ مُؤْوِيَ﴾ [1] .

واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئاوی داین و خواردن و خۆراکی پێداین و دالدەو پەنای داین، دەنا چەندان کەسی تر هەن کە تێرو تەژی نەکراون، پەناو دالدەش نەدراون، بێ خواردن و خۆراك و بێ پشت و پەنان.

---

(١) مسلم ٤/٢٠٨٥ .

١٠٩- ١١/ ﴿ اللهمَّ عَالِمَ الْغَيْبِ والشَّهَادة فَاطِرَ السَّموَات وَالأَرْضِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي، وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ، وَ أَنْ أَقْتَرِفَ عَلَى نَفْسِي سُوءاً، أَوْ أَجُرَّهُ إِلَى مُسْلِمٍ﴾ (١) .

**واته : ئەی خوای پەنهان و ئاشکراکان، دروستکەری ئەرزو ئاسمانەکان، پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێکی، گەواهی دەدەم کە جگە لەتۆ هیچ خوایەکی تر نیە خۆم بەتۆ لە خراپەی دڵ و دەروونم و لە زەرەرو زیان و خراپەی شەیتانی بەدو هاوەڵدانانی دەپارێزم، خۆم دەپارێزم لەوەی کە بۆخۆم هیچ گوناه و تاوانێك لەخۆم بنالێنم و ئەنجامی بدەم، یا بیبەمە سەر هیچ موسڵمانێك و تێیوە بگلێنم.**

١١٠- ١٢/ ﴿ يَقْرَأُ (الم) السَّجْدَةَ وَتَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾(٢) . **سورەتی (السجدة) وسورەتی (الملك) تا کۆتایی دەخوێنی .**

---

(١) أبو داود ٤/٣١٧ وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٤٢ .

(٢) الترمذي والنسائي وانظر، صحيح الجامع ٤/٢٥٥ .

١١١/١٣- ﴿اللهمَّ [١] أَسْلَمْتُ نَفْسي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْري إِلَيكَ، ووَجَّهْتُ وَجْهي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْري إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجا منْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذي أَنْزَلْتَ وَبِنَبِيِّكَ الَّذي أَرْسَلْتَ﴾ [٢].

**واته : خوایه خۆم تەسلیم و ڕادەستی تۆ کـردووه، کاروبـاری خۆم بەتۆ سپاردووەو پەنام بردۆتـە بـەر تـۆ، هـەرتۆ پـشت و پەنامانی، بەخۆشی و بەناخۆشی بۆ لای تۆیین، هیچ پـشت و پەناگەو دالّدو ڕزگارگەیەك نیه تەنها لەلای تۆ نەبێ، خوایه بڕوام بەو پەرتووكەی تۆ هێناوه كه ناردوتەو دات بەزانـدووه، بڕوام بەو پێغەمبەره هێناوه كه ڕەوانەت كردووه .**

---

(١)(ئەگـەر ویـستت بـچیته سـەر جێگـەی خـەوتنت ئـەوا بەوێنـەی دەست نوێژگرتنت بۆ نوێـژ دەسـت نوێـژ هـەلگرەو پاشان لەسـەر لای ڕاسـته پالكەوەو ئینجا بلێ..) فەرموودەكه.

(٢) (فەرموویەتی (ئەگەر مردی، ئەوه لەسەر فیترەت مـردووی)، البخاري مع الفتح ١١/١١٣ ومسلم ٤/٢٠٨١ .

## ٢٩-دوعاكردنی کاتی شەو بەئاگابێیتەوەو خۆت بسوڕێنی

١١٢- ﴿لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ، رَبُّ السَّموات وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ﴾ (١) .

**واتە : هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی کە (الله)یە، خوایەکی تاك و تەنیاو بەتواناو دەسەلآت و زەبر بەدەستە، پەروەردگاری ئەرزو ئاسمانەکان و ئەوەی کە لەنێوانیاندا هەیە، ئەو خوایە زۆر بەدەسەلآت و زاڵ و لێخۆشبووە.**

## ٣٠- دوعای لەخەودا ترسان و ئەوەی هەست بەدڵەراوکێ دەکات

١١٣- ﴿أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ، وَشَرِّ

---

(١) ئەمە لەکاتێکدا دەڵێ ئەگەر لەشەودا خۆی لەتەنیشتێکەوە وەرگێڕا سەر تەنیشتەکەی دیکەی.

أخرجه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي ١/٥٤٠ والنسائي في عمل اليوم والليلة وابن السني وانظر، صحيح الجامع ٤/٢١٣ .

عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَنْ يَحْضُرُونِ﴾[1].

**واته :** خۆم بە وشە تەواو و پیرۆزەکانی خوای گەورە لە سزاو تورەبوونی خۆی دەپارێزم، خۆم لەزەرەرو زیان و خراپەی بەندەکانی دەپارێزم، وەخۆم لە وەسوەسەو خەتەرەو خوتخوتەی خراپی شەیتانەکان دەپارێزم لە ئامادەبوونیان، لە کاتی سەرەمەرگ و لە هەموو کات و پێگاڤەکانی ژیاندا .

## ٣١- ئەوەی لەکاتی بینینی خەوی ناخۆش دەکرێ

١/١١٤- ﴿يَنْفُثُ عَنْ يَسَارِهِ﴾ ثلاثاً[2].

پێویستە ئینسان کاتێ خەونی خراپ و ناخۆش و بەترس دەبینێ، کە هەستایەوە (٣)جار : أعوذ بالله من الشيطان الرجيم بلێ و تف بە لای دەستە چەپی خۆیدا لەزەوی بکات .

٢/١١٤- ﴿يَسْتَعِيذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ وَمِنْ شَرِّ مَا رَأَى﴾ (ثَلاَثَ مَرَّاتٍ)[3] .

---

(١) أبو داود ٤/١٢ وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٧١ .

(٢) مسلم ٤/١٧٧٢ .

(٣) مسلم ٤/١٧٧٢، ١٧٧٣ .

**واتە** : سێ جار خۆی بەخوا لە شەیتانەکانی نەفرەت لێکراو و لەزەرەرو زیان و ئەوخراپەی کە لەخەو بینیویەتی دەپارێزێ و پەنا دەگرێت، دەڵێ : أعوذ بـالله مـن الـشيطان الـرجيم، واتە: خوایە خۆم بە تـۆ لـە شـەیتانی دوورخـراوەو نـەفرەت لێکراو دەپارێزم لەو خەونە ناخۆشە. .

٣/١١٤- (لايحدث بها احدا) [1] .

نـابێ خەونەکـە بـۆ کـەس بگێڕێتـەوە، ئـەویش تـەعبیری خەونەکە بداتەوە، نەوەکو چۆن بڵێ وادەرچێت و بێتەدی .

٤/١١٤- ﴿يَتَحَوَّلُ عَنْ جَنْبِهِ الَّذي كَانَ عَلَيْهِ﴾ [2] .

**واتە**: دوای ئەوەی کەخەون دەبینێ و لەخەو وەئاگا دێ، دەبێ خۆی لەسەر ئەو لاتەنیشتە وەرگێڕێ .

٥/١١٥- ﴿يَقُومُ يُصَلِّي إِنْ أَرَادَ ذلكَ﴾ [3] .

ئەگەر ویستی لەخەو هەڵدەستێ و نوێژی سوننەت دەکات .

---

(١) مسلم ٤/١٧٧٢ .

(٢) مسلم ٤/١٧٧٣

(٣) مسلم ٤/١٧٧٣ .

## ٣٢- دوعای پاڕانەوە لە نوێژی وتردا

١١٦/١- ﴿اللهمَّ اهْدني فيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافني فيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّني فيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَبَارِكْ لي فيمَا أَعْطَيْتَ، وَقني شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ إِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ (وَلاَ يعِزُّ من عَادَيْتَ)، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ﴾[1].

**واتە : خوایە ڕێنمایم بکە لەگەڵ ئەوانەی کە ڕێنمایت کردوون، ساغ و سەلامەت و بێ وە بیم بکە وەکو ئەوانەی کە ساغ و سەلامەت و بێ بەڵاو پارێزراوت کردوون، خوایە هاوکاری‌و پشت و پەنام بکە وێرای ئەوانەی پشت و پەنات‌و هاوکاریت کردون، خوایە ئەوەی کە پێم دەبەخشی بۆم پاك و پیرۆزو پڕ لەبەرەکەت بکە، لە زەرەرو زیانی ئەوە بمپارێزە کە بڕیارت لەسەری داوە، خوایە تۆ بڕیار بەسەر خەڵك و بوونەوەر دەدەیت، کەس بڕیار بەسەر تۆدا نادات، خوایە ئەو**

(١) أخرجه أصحاب السنن الأربعة وأحمد والدرامي والحاكم والبيهقي وما بين المعكوفين للبيهقي وانظر، صحيح الترمذى ١٤٤/١وصحيح ابن ماجه ١٩٤/١ و رواه الغليل الألباني ١٧٢/٢ .

کەسەی کەتۆ پشت و پەنای دەکەی قەت گومڕاو سەرگەردان نابێ، ئەو کەسەش کەتۆ نەیاری و دوژمنایەتی و بەرهەڵستی دەکەی قەت زاڵ و دەسەڵاتدارو بەهێز نابێ، خوای پەروەردگارمان هەرتۆ بەرزو بەڕێزو پاك و پیرۆزو بەدەسەڵات و شكۆداری .

٢/١١٧- ﴿اللهمَّ إنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمَعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُبِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ﴾ [١] .

واتە : خوایە خۆم بە ڕەزامەندی تۆ لە سزاو خەشم و توڕەییت دەپارێزم، بەتۆ خۆم لەتۆ دەپارێزم، خوایە ئەو سوپاس و ستایشانە کە بۆتۆ دەیکەم شایانی زیاتری، هەر وەك تۆ بەبێ شومار سوپاس و ستایشت لەسەر خۆت کردووە بەمن ناکرێت.

٣/١١٨- ﴿اللهمَّ إِيَّاكَ نَعْبُدُ، وَلَكَ نُصَلِّي وَنَسْجُدُ، وَإِلَيْكَ

---

(١) آخرجه أصحاب السنن الأربعة وأحمد، انظر، صحيح الترمذي ١٨٠/٣ وصحيح ابن ماجه ١٩٤/١ والإرواء ١٧٥/٢ .

نَسْعَى وَنَحْفدُ، نَرْجُو رَحْمَتَكَ، وَنَخْشَى عَذَابَكَ، إنَّ عَـــذَابَكَ بالْكَافرينَ مُلْحَقٌ، اللهمَّ إنَّا نستعينُكَ، وَنَستَغْفرُكَ، وَنُثْني عَلَيْكَ الَخيْرَ، وَلاَ نَكْفُرُكَ، وَنُؤمِنُ بِكَ، وَنَخْضَعُ لَكَ، وَنَخلَــعُ مَــنْ يَكْفُرُكَ﴾ [1] .

**واته : خوایه هەر تۆ دەپەرستین و بەندایەتی تـۆ دەکـەین و نوێژ بۆ تۆ دەکـەین، کڕنـۆش بـۆ تـۆ دەبـەین، بـۆ لای تـۆ هەڵپەدەکەین و هەوڵ دەدەین پەلە دەکەین، تکـای ڕەحمـەتی تۆ دەکەین، لەسزای تۆ دەترسین، چونکە سـزای تـۆ بـە بـێ باوەڕان دەگات و پێیان وەدەنوسێت، خوایە داوای کۆمـەکی و دادو فریاد، داوای لێخۆشبوون هەر لەتۆ دەکـەین، بەچـاکە هەر باسی تۆ دەکەین، هەمیشە بەچـاکە باسـی چـاکەکانت دەکەین، بەرانبەرت بێ باوەڕ نابین، بڕوامان بەتۆ هەیـە، بـۆ تـۆ ملکـەچ دەبـین، خۆمـان لـەو کەسـە دوور دەگـرین و دادەماڵێین کە بێ باوەڕی بەرانبەر تۆ دەکات .**

---

(١) أخرجـه البيهقـي في الـسنن الكـبرى وصـحح إسـناده ٢/٢١١ وقـال الـشيخ الألباني في إرواء الغليل وهذا إسناده صـحيح ٢/١٧٠ وهـو موقـوف علـى عمر .

## ٣٣- زیکری دوای سەلام دانەوە لە نوێژی وتر

١١٩- ﴿سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ﴾ ثَلاثَ مرَّاتٍ وَالثَّالِثَةُ يَجْهَرُ بِهَا وَيَمُدُّ بِهَا صَوْتَهُ يَقُولُ(رَبِّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوحِ) ﴾[1].

**واتە : سێ جار دەڵێ : پاکی و بێ گەردی بۆ خواو پاشای پاك و بێگەرد ، لەجاری سێیەمیدا ئەوە درێژ دەکاتەوەو بەدەنگ دەڵێ : پەروەردگاری فریشتەو گیان .**

## ٣٤- دوعای خەم و پەژارە

١/١٢٠- ﴿اللهمَّ إِنِّي عَبْدُكَ، ابْنُ عَبْدِكَ، ابْنُ أَمَتِكَ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ

---

(١) رواه النسائي ٣/٢٤٤ والدار قطني وغيرهما وما بين المعكوفين زيادة للدار قطني ٢/٣١ واسناده صحيح، انظر، زاد المعاد بتحقيق شعيب الأرناؤوط وعبدالقادر الأرناؤط ١/٣٣٧ .

الْقُرْآنَ رَبيعَ قَلْبِي، وَنُورَ صَدْرِي وَجَلاَءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي﴾[1] .

**واته : خوايه من بەندەی تۆم، کوڕی بەندەی تۆم، کوڕی دایکە بەندەی تۆم، خوایە چارەنووس و نێو چەوانم بەدەست تۆیە، حوکمی تۆ بەسەرمدا جێبەجێیەو بڕیارت لە مندا زۆر دادگەرو بەجێیە، خوایە بەهەموو ناوێك كە ناوی تۆیەو ناوت پێ لەخۆت ناوەو لە پەرتووکی خۆتدا دادبەزاندووە یا فێری یەکێك لە دروستکراوەکانی خۆت کردووە، یا لەزانست و زانیاری پەنهانی خۆتدا لەلای خۆت هەڵتگرتووەو پێی کاریگەری، داوات لێدەکەم کە قورئان بکەیتە شیفاو بەهاری دڵم، ڕوناکی سینەم، دوورخەرەوەو ڕەوێنەرەوەی خەم و پەژارەم و، لابەری خەفەتەکانم .**

۲/۱۲۱- ﴿اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ

---

(۱) أحمد ۱/۳۹۱ وصححه الألباني .

وَالْكَسِلِ، وَالْبُخْلِ والْجُبْنِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّ جَالِ﴾ [1] .

**واته** : خوایه خۆم بەتۆ لەخەم و پەژارەو دڵتەنگی و بێ دەستەڵاتی سستی و تەمبەڵی و بێ تاقەتی و بێ هێزی و لە ترسنۆکی ڕژدی دەپارێزم، خۆم دەپارێزم لە داهاتن و چەمانەوە بەهۆی قەرزاری، وەخۆم دەپارێزم لەسەرکەوتنی پیاوانی خراپ و خوانەناس، لەژێر کەوتنی پیاوانی چاك و پاکی ئیسلام .

## ٣٥-دوعای خەم و پەرێشانی

١٢٢/١- ﴿لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ السَّمَوات وَرَبُّ الأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ السَّمَوات وَرَبُّ الأَرْضِ وَرَبُّ

(١) البخاري ٧/١٥٨ پێغەمبەر ﷺ ئەم دوعایەی زۆر دەكرد .انظر، البخاري مع الفتح ١١/١٧٣ .

الْعَرْشِ الْكَرِيمُ﴾ [1] .

واتە : هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی کە (الله)یە، خوایەکی زۆر گەورەو شکۆدارو لەسەر خۆو بێ پەلەیە، هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی کە پەروەردگاری تەخت و بارەگایەکی زۆر گەورەو گوشادە، هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی کە پەروەردگارو بەڕێوەبەری ئەرزو ئاسمانەکان و تەخت و بارەگای بەرزو پیرۆزە .

٢/١٢٣- ﴿اللهمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو فَلاَ تَكِلْنِي إِلى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَأَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ، لاَ إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ﴾ [2].

واتە : خوایە تکاو داوا لە ڕەحمەتی تۆ دەکەم کە بۆ چرکەسات و چاو تروکانێکیش نەمدەیتە دەست نەفسی بەدی خۆم، چونکە کاری خراپم پێ دەکا، داواکارم هەموو کاروبارەکانی ژیانم بۆ چاك بکەی، چونکە بێگومان جگە

---

(١) البخاري ١٥٤/٧ ومسلم ٢٠٩٢/٤ .

(٢) أبو داود ٣٢٤/٤ وأحمد ٤٢/٥ وحسنه الألباني في صحيح أبو داود ٩٥٩/٣.

لەتۆ هیچ خوایەکی بەهەق و ڕەوا نیە .

٣/١٢٤- [ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْـتَ سُـبْحَانَكَ إِنِّـي كُنْـتُ مِـنَ الظَّالِمِينَ﴾[1] .

<u>واتە</u> : خوایە هیچ خوایەکی بەهەق نیە جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی بۆ تۆ، بەڕاستی من ستەمم لەخۆم کرد، کەبوومـە یەکێك لە ستەمکاران .

٤/١٢٥- ﴿اللهُ اللهُ رَبِّي لاَ أُشرِكُ بِهِ شَيْئاً﴾[2] .

واتـە : خوایـە خوایـە، ئـەی پـەروەردگارم بـەهیچ شـتێك هاوبەشی بۆ تۆ پەیداناکەم و هیچ شتێك ناکەمە شـەریك و هاوبەشی دەسەڵاتی تۆ .

## ٣٦- دوعـای گەیشتنە دوژمن و خەڵکی ستەمکارو زۆردار

١/١٢٦- ﴿اللهمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِمْ وَنَعُوذُ بِـكَ مِـنْ

---

(١) الترمذي ٥٢٩/٥ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ٥٠٥/١ وانظر، صحيح الترمذي ١٦٨/٣ .

(٢) أخرجه أبو داود ٨٧/٢ وانظر، صحيح ابن ماجه ٢٣٥/٢ .

شُرُورِهِمْ﴾ [1] .

**واتە :** خوایە خۆت بە گژیاندا بچۆو لەسەرو ملیان بدە، خوایە بەتۆ خۆمان لەزەرەرو زیان و خراپەکانیان دەپارێزین .

٢/١٢٧- ﴿اللهمَّ أَنْتَ عَضُدِي، وَأَنْتَ نَصِيرِي، بِكَ أَحُولُ وَبِكَ أَصُولُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ﴾ [2] .

**واتە :** خوایە تۆ تاکە تواناو، پاڵپشت و سەرخەری منی، خوایە بەتۆوە ئەجولێم و بەهێزم، بەتۆوە دەچمە سەریان و هێرشیان بۆ دەبەم، بەتۆوە لەگەڵیاندا دەجەنگم و شەڕو کوشتار دەکەم .

٣/١٢٨- ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ [3] .

**واتە :** خوای گەورە بەسمانە پشت و پەنامان بێ و، چاکترین پشت و پەنایە .

---

(١) أبو داود ٢/٨٩ وصححه الحاكم ووافقه الذهبي ٢/١٤٢ .

(٢) أبو داود ٣/٤٢ والترمذي ٥/٥٧٢، وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٨٣ .

(٣) البخاري ٥/١٧٢ .

## ٣٧- دوعای ئەو کەسەی کە لەستەمی زۆردارو دەسەلأتدار بترسێت

١/١٢٩- ﴿اللهمَّ رَبَّ السَّموات السَّبْعِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، كُنْ لِي جَاراً مِنْ فُلان بْنِ فُلانٍ، وَأَحْزَابِه مِنْ خَلاَئِقِكَ، أَنْ يَفْرُطَ عَلَيَّ أَحَدٌ مِنْهُمْ أَوْ يَطْغَى، عَزَّ جَارُكَ، وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ، وَلاَ إِلَه إِلاَّ أَنْتَ﴾ [١] .

**واتە : ئەی خوای پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و تەخت و بارەگای گەورەو گوشاد، ببە پشتیوان و هاوکارم لەدژی فلانی کوڕی فلان و پارت و کۆمەڵەکەی لە دروستکراوەکانی خۆت، نەك یەکێك لەوان بەسەرمدا زاڵبێ و دەستی برِوار دەستدرێژی و زێدەڕۆییم بکاتە سەر، چونکە هاوکاری و پاڵپشتی تۆ زۆر بەهێزو کاریگەرە، کەس خۆی لەبەردەمدا ڕاناگرێ، وە سوپاس و ستایش و باسیشت زۆر**

---

(١) البخاري في الأدب المفرد برقم ٧٠٧ وصححه الألباني في صحيح الأدب المفرد برقم ٥٤٥ .

**دیارو بەرچاوە، دروستکراوەکانت زۆر سوپاس و ستایشت دەکەن، چونکە جگە لەتۆ هیچ خوایەکی بەهەق و شایستە نیە، تەنها تۆ نەبی .**

۲/۱۳۰- ﴿الله أَكْبَرُ، الله أَعَزُّ مِنْ خَلْقِه جَمِيعاً، الله أَعَزُّ مِمَّا أَخَافُ وَأَحْذَرُ، أَعُوذُ بِاللهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ، الْمُمْسِكُ السَّموات السَّبْعِ أَنْ يَقَعْنَ عَلَى الأَرْضِ إِلاَّ بِإِذْنِه، مِنْ شَرِّ عَبْدِكَ فُلاَن، وَجُنُودِه وَأَتْبَاعِه وَأَشْيَاعِه، مِنَ الْجِنِّ وَالانس، اللهم كن لِي جاراً من شَرهم جَلَّ ثَنَاؤُكَ وَعَزَّ جَارُكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ﴾ (ثَلاثَ مَرَّات) [1] .

**واتە : خوا گەورەیە، خوا لەهەموو دروستکراوەکانی خۆی بەهێزو دەسەڵاتدارترە، خوا زۆر لەوە بەهێزو بەدەسەڵاتترە کەمن لێی دەترسم و ترسی لێ دەکەم، خۆم بەو خوایە دەپارێزم کە (الله)یەو جگە لەو خوایە هیچ خوایەکی تری بەهەق و شایستە نیە، ئەو خوایە ڕاگری هەر حەوت ئاسمانەکانە تانەکەونەسەر زەوی و بەسەر یەکدا نەکەون،**

---

(۱) البخاري في الأدب المفرد برقم ۷۰۸ وصححه الألباني في صحيح الأدب المفرد برقم ٥٤٦ .

مەگەر بە ڕوخسەتی خۆی نەبێ کە لەڕۆژی دوایی و کاتی دونیا تێکچوون فەرمان بە وێرانکردنیان دەکات، خۆم دەپارێزم لەزەرەرو زیان و خراپەی فلان کەسی بەندەت و لەسەر بازودارو دەستەو شوێن کەوتوان و هاوکارو کۆمەڵەکانی لەئادەمیزادو جنەکان، خوایە ببە تاکە پشتیوان و هاوکارم، لەدژی زەرەرو زیان و خراپەی هەموویان، سوپاس و ستایشی تۆ زۆر بەرزو ئاشکراو دیارە، پشتیوان و هاوکاری تۆ زۆر بەهێزو بەتوانایە بەجۆرێ، کەس خۆی لەبەردەم ڕاناگرێ و بەرگری ناکا، خوایە گیان ناوی تۆ زۆر بەرزو بەڕێزو پیرۆزە، جگە لەتۆ هیچ خوایەکی تری بەهەق و شایستە نییە، (سێ جار ئەوە دەگوترێت) .

## ٣٨- دوعا لەدوژمن

١٣١- ﴿اللهمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، سَرِيعَ الْحِسَابِ، اهْزِمِ الأَحْزَابِ، اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ﴾ (١) .

---

(١) مسلم ١٣٦٢/٣ .

واته : ئەی خوای دابەزێنەری قورئان و پەرتووك، ئەی خوای خاوەن لێپرسینەوەی زۆر خێرا، پارتە نەیارەکانت تێك بشکێنە، خوایە تێکیان بشکێنی و دۆڕاویان بکەی و بیان هەژێنی و پارچە پارچەیان بکەی .

## ٣٩- ئەگەر کەسێك لەیەکێك یان لە خەڵکێك بترسێ دەڵێ:

١٣٢- ﴿اللهمَّ اكْفِنيهِمْ بِمَا شِئْتَ﴾ [١].

واته : خوایە بەهەرشتێك کەتۆ دەتەوێ، دوژمنانی خۆت لەناو ببە .

## ٤٠- دوعای کەسێك لە بیروبڕوادا دووچاری گومان و دوو دڵی دەبێت

١٣٣/١- ﴿يَسْتَعِيذُ بِاللهِ﴾ [٢]، خۆی بەخوا دەپارێزێ و دەڵێ :

---

(١) مسلم ٤/ ٢٣٠٠ .

(٢) البخاري مع الفتح ٦/٣٣٦ ومسلم ١/ ١٢٠ .

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم يا دەڵێ: اعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم، واتە : خوایە خۆم بەتۆ لەشەیتانی بەدو نەگریس و دوورخراو و نەفرەت لێکراو دەپارێزم و دالدەدەم، یاخۆم بەخوای بیسەرو زۆر زانا لەشەیتانی بەدو نەفرەت لێکراو دەپارێزم و خۆمی لێ پەنا دەدەم تا زەرەرو زیانم پێ نەگەیەنێ .

٢/١٣٣- ﴿يَنْتَهِي عَمَّا شَكَّ فِيهِ﴾ [١] .

دەبێ لەدڵ و دەروون و مێشکی خۆیدا کۆتایی بەوە بێنێ کە گومان و دوو دڵی لێی هەیەو دڵ و دەروون و بیرو هۆش و خۆی لەسەر لابدات، بۆ ئەوەی زیاتر خوتخوتەی خراپی بەسەردا زاڵ نەبێت .

٣/١٣٤-يَقُولُ ﴿ آمَنْتُ بِاللهِ وَرُسُلِه﴾ [٢].

دەڵێ : ئیمانم بەخواو پێغەمبەرەکانی هێنا، واتە : ئیمان هێنانی خۆی دووپات و نوێ دەکاتەوە .

---

(١) البخاري مع الفتح ٦/٣٣٦ ومسلم ١/١٢٠

(٢) مسلم ١/١١٩ – ١٢٠ .

٤/١٣٥- يَقْرَأُ قَوْلَهُ تَعَالَى ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ۝﴾(سورة الحديد) [١].

**واته** : ئەو ئایەتە دەخوێنێ کەخوای گەورە دەفەرمووێ: : خوای گەورە ئەو خوایەیە کەیەکەمینەو کەس پێش ئەو نەبووە، دواهەمینەو کەس پاش ئەو نیەو نامێنێ، ئەویش هەردەمێنێ، ئاشکراو دیارەو قودرەت و دەسەلاتی لە بوونەوەردا بەرجەستەیە، نادیارو شاراوەیەو وەکو خۆی کەس پەی پێ نابـاو نـابینێ و نـازانی چیەو چۆنە، بەهەموو شتێکیش زاناو ئاگادارە .

## ٤١- دوعای قەرز دانەوە

١/١٣٦- ﴿اللهمَّ اكْفِنِي بِحَلاَلِكَ عَنْ حَرَامِكَ وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ﴾[٢].

---

(١) سورة الحديد، الآية ٣ . أبو داود ٣٢٩/٤ وحسنه الألباني في صحيح أبو داود ٩٦٢/٣ .

(٢) الترمذي ٥٦٠/٥ وانظر، صحيح الترمذي ١٨٠/٣ .

**واته** : خوایه بە ڕزق و ڕۆزی حەلال و فراوانی خۆت چاوتێرو بێ نیازم بکە لە ڕزق و ڕۆزی کەم و حەڕامو دەرخواردم نەدەیت، بەفەزڵ و بەخششی خۆت دەوڵەمەندو بێ نیازم بکە لەغەیری خۆت، لەوەی کە لەدەستی خەڵك دایە، بەجۆرێ کە چاوم لەدەستی کەس نەبێ و پێویستیم بەکەس نەبێت و داوا لەکەس نەکەم .

٢/١٣٧- ﴿اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ﴾ [1] .

لەپێشتر راڤە کراوە

## ٤٢- دوعای وەسوەسە لە نوێژو لەکاتی قورئان خوێندن دا

١٣٨- ﴿أَعُوذُ بِاللهِ مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ وَاتْفُلْ عَلَى يَسَارِكَ (ثَلاثاً)﴾[2] .

---

(١) البخاري ٧/١٥٨ .

(٢)ئەمە لەفەرموودەی عوسمانی کوڕی ئەبو لعاصەوە ﷺ ئەوەشی تێدایە کە دەڵێ: ( ئەوەم جێبەجێ کرد، خوای گەورەش ئەمەی لێ دوورخستمەوە).مسلم ٤/١٧٢٩.

**واتە:** خوایە خۆم بەتۆ لە شەیتانی پیس و نەگریس و نەفرەت لێکراو دەپارێزم، با بەلای چەپ ئاورِ بداتەوەو تف بکات –سێ جار– .

## ٤٣- دوعای کەسێك کارێکی لەسەر سەخت و زەحمەت و گران و ئاڵۆز دەبێت

١٣٩- ﴿اللهمَّ لاَ سَهْلَ إلاَّ مَا جَعَلْتَهُ سَهْلاً وَأَنْتَ تَجْعَلُ الْحَزْنَ إذَا شِئْتَ سَهْلاً﴾ (١) .

**واتە** : خوایە هیچ کارو بارێك سووك و ئاسان نیە لەسەر سەری ئینسان، مەگەر کارێك کەتۆ سووك و ئاسان و دەستەبەرت کردووە، وە ئەگەر تۆ بتەوێ هەموو کارێکی گران و سەخت زۆر سووك و ئاسان دەکەی، هەموو خەم و پەژارەیەك لەسەر ئینسان لا دەدەیت .

---

(١) رواه ابن حبان في صحيحه برقم ٢٤٢٧ (موارد) وابن السني برقم ٣٥١ وقال الحافظ هذا حديث صحيح، وصححه عبدالقادر الأرناؤوط في تخريج الأذكار للنووي ص ١٠٦ .

## ٤٤- ئەگەر مرۆڤ گوناه و تاوانێکی کرد چی بکات

١٤٠- ﴿ مَا مِنْ عَبْدٍ يُذْنِبُ ذَنباً فَيُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللهَ إِلاَّ غَفَرَ اللهُ لَهُ﴾(١)

**واتە: هەر بەندەیەك ئەگەر گوناه و تاوانێکی کرد، پێویستە دەستنوێژێکی جوان و پاك بشواو، پاشان دوو ڕکعات نوێژێکی تەوبە بکا، پاشان لەسەر ئەو گوناهە داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە بکات، ئەوسا خوا هەر لێی خۆش دەبێت .**

## ٤٥- دوعای دەرکردن و وە لانانی شەیتان و خوتخوتە خراپەکانی

**بەم زیکرو دوعایانە شەیتان و وەسوەسەی دەردەکرێت :**

١/١٤١- ﴿الأَسْتِعَاذَةُ بِاللهِ مِنْهُ﴾ (٢) .

---

(١) أبو داود ٨٦/٢ والترمذي ٢٥٧/٢ وصححه الألباني في صحيح أبي داود ٢٨٣/١ .

(٢) أبو داود ٢٠٦/١ والترمذي وانظر، صحيح الترمذي ٧٧/١ وانظر، سورة المؤمن آية ٩٨-٩٩ .

**واته: بەخۆپاراستن بەخوای گەورە لەشەیتان.**

**خوێندنی** (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) .

۲/۱٤۲- ﴿الأَذان﴾ [۱] .

**واته: بە بانگدان .**

۳/۱٤۳- ﴿الأَذْكَارُ وَقِراءَةُ الْقُرآن﴾ [۲] .

**واته : بە زیکرو قورئان خوێندن .**

---

(۱) مسلم ۲۹۱/۱ والبخاري ۱٥۱/۱ .

(۲)(ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان، بێگومان شەیتان لەو ماڵە ڕادەکات کەسورەتی -نەلبەقەرەی- تێدا دەخوێندرێت). هەروەها ئەوەی کەدەبێتە هۆی دەرکردنی شەیتان بریتییە لەزیکرەکانی بەیانیان و ئێواران و نوستن و لەخەوهەستان و=

=زیکرەکانی چوونە ماڵەوەو دەرچوون و، زیکرەکانی چوونە نێو مزگەوت و چوونە دەرەوە لەمزگەوت و هی دیکەش لەو زیکرانەی کەشەریعەت ڕێی پێداون وەکوو خوێندنەوەی ئایەتی کورسی لەکاتی خەوتندا هەروەها خوێندنەوەی دوو ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی (ئەلبەقەرە)و، هەروەها کەسێك سەد جاران بڵێ (لاالـه الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير)) ئەوا ئەو ڕۆژە هەتاسەری لەشەیتان پارێزراو دەبێ، بەهەمان شێوە بانگدانیش دەبێتە هۆی دەرکردنی شەیتان. رواه مسلم ٥۳٤/۱

## ٤٦- دوعای شتێك كه بەسەر ئینساندا زاڵەو پێی ڕازی نیه

١٤٤- ﴿قَدَرُ اللهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ﴾ [١] .

**واته** : ئەو كارەی بووە، بڕیارو ئەندازە گیری خوای گەورەیە كە بڕیاری داوەو ئەوە بووە كەخوا بڕیاری داوەو ویستویەتی .

## ٤٧- پیرۆزبایی كردن له منداڵ بوون و وەڵامدانەوەی

١٤٥- ﴿بَارَكَ اللهُ لَكَ فِي الْمَوْهُوبِ لَكَ، وَشَكَرْتَ الْوَاهِبَ، وَبَلَغَ أَشُدَّهُ وَرُزِقْتَ بِرَّهُ﴾، وَيَرُدُّ عَلَيْهِ الْمُهَنَّأُ فَيَقُولُ : ﴿بَارَكَ اللهُ لَكَ وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَزَاكَ اللهُ خَيْراً، وَرَزَقَكَ اللهُ مِثْلَهُ وَأَجْزَلَ ثَوَابَكَ﴾ [٢] .

---

(١)( بڕواداری بەهێز لای خودا چاكترو خۆشەویستره له بڕواداری بی هێزو لەهەردوو لاشیان خێرو چاكه هەیه، هەمیشه پێداگر بەلەسەر ئەوەی كەوا سوودو قازانجی پێ دەگەیەنێتو یارمەتیش هەر لەخودا بخوازەو نەكەی بی هێزی رووت تێ بكاتو ئەگەریش تووشی شتێ بوویت مەڵێ ئەگەر ئاواو ئاوام كردبا بەڵكو (قد ر الله وماشاء فعل) چونكه گوتنی وشەی (ئەگەر) دەرگابۆ كاری شەیتان والا دەكات.مسلم ٢٠٥٢/٤ .

(٢) انظر، الأذكار للنووي ص ٣٤٩ وصحيح الأذكار للنووي لسليم الهلالي ٧١٣/٢ .

**واتە** : خوا ئەو منالّە بەخشراوەت لیّ پیرۆزو بەفەریکا، بۆت بهیلّیّ، سوپاسی خوای بەخشەر بکەی، بگاتە تەمەنیّکی زۆر، رزق و رۆزیت لە خیّرو بیّرو چاکەی ئەو بەخشراوە پیّدرابیّ، ئەوسا پیرۆزبایی لیّکراویش لە وەلاّمیدا دەلّیّ : خوا لەتۆش پیرۆز بکاو بۆ تۆشی پیرۆز بکا، خوا پاداشتی چاکەو بەخیّرت بداتەوە، خوا وەکو ئەوەی بەخشراوی چاك و پاکت پی ببەخشیّت، زۆر خیّردارت بکاو پاداشتت بداتەوە .

## ٤٨- ئەوەی کە منداڵەکانی پیّ دەپاریّزریّ و لیّ دەپاریّزریّت

١٤٦- كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُعَوِّذُ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ (أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ)[1] .

**واتە** : پیّغەمبەر ﷺ حەسەن و خوسیّنی نەوەکانی بەم

(١) البخاري ٤/١١٩ من حديث ابن عباس (رض)

دوعایە دەپاراست و دەیگوت: بە رتە بەرزو بەرێزو تێرو تەواوەکانی خوای گەورەتان دەپارێزم لە هەموو شەیتان و جرو جانەوەرێکی زیانبەخش، لە هەمووو چاو پیس و لۆمەکەرێك .

## ٤٩- دوعا کردن بۆ نەخۆش لەکاتی سەردانی کردنیدا

١٤٧/١- ﴿لاَ بَأْسَ طَهُورٌ إِنْ شَاءَ اللهُ﴾[١] .

**واتە** : هیچ نیە، إنشاءالله لەنەخۆشی چاك دەبیەوەو لە گوناهیش پاك دەبیەوە .

١٤٨/٢- ﴿أَسْأَلُ اللهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيكَ﴾(سَبْعَ مرات)[٢].

---

(١) البخاري مع الفتح ١١٨/١٠ .

(٢) هەر بەندەیەکی موسلمان سەردانی هەر نەخۆشێك بکات کە هێشتا وادەی مردنی نەهاتبێ ئینجا حەوت جاران بڵێ (اسال الله العظیم رب العرش العظیم ان یشفیك) ئەوا چاك بوونەوەی مسۆگەرە أخرجه الترمذي وأبو داود، وانظر، صحیح الترمذي ٢١٠/٢ وصحیح الجامع ١٨٠/٥ .

**واتە** : داوا لەخوای بەرزو مەزنی پەروەردگاری تەخت و بارەگای بەرزو مەزن و گوشاد دەکەم شیفات بۆ بێنێ و چاکت بکاتەوە، حەوت جار ئەوە دەڵێ .

## ٥٠- خێرو پاداشت و پلەو پایەی سەردانی کردنی نەخۆش

١٤٩- قال ﷺ : (إذا عَادَ الرَّجُلُ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ مَشَى فِي خَرَافَةِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَجْلِسَ فَإِذَا جَلَسَ غَمَرَتْهُ الرَّحْمَةُ، فَإِنْ كَانَ غُدْوَةً صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ كَانَ مَسَاءً صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ)(١) .

**واتە** : ئەگەر پیاوێك لەبەر نەخۆشی سەردانی برا موسڵمانەکەی بکا، بەناو باخ و باخاتێکی بە میوەجاتی بەهەشتدا دەڕوا تا دادەنیشێ، ئەگەر دانیشت خوا بەڕەحمەت و سۆزی خۆی دایدەپۆشێ، جا ئەگەر بەیانی بوو ئەوا حەفتا هەزار فریشتە بۆی دەپاڕێنەوەو داوای درودو ڕەحمەت و

---

(١) رواه الترمذي وابن ماجه وأحمد، انظر، صحيح ابن ماجه ٢٤٤/١ وصحيح الترمذي ٢٨٦/١ وصححه أيضا أحمد شاكر .

لێخۆشبوونی بۆ دەکەن لە خوای گەورە تا دەبێتە ئێوارە، وە ئەگەر ئێوارەش بێ، ئەوا حەفتا هەزار فریشتە بۆی دەپاڕێنەوەو داوای درودو ڕەحمەت و لێخۆشبوونی بۆ دەکەن لەخوای گەورە تا بەیانی دادێت .

## ٥١- دوعای نەخۆشێك كە لەژیانی خۆی بێزارو بێ هیوایە

١٥٠/١- ﴿اللهمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفيقِ الأَعْلَى﴾(١) .

**واتە** : خوایە لێم خۆشبەو ڕەحم پێ بکە، بمگەیەنە بە هاوڕێی هەرە بەرز، بمگەیەنە بەخۆت .

١٥١/٢- ﴿جَعَلَ النَّبيُّ ﷺ عِنْدَ مَوْتِه يُدْخِلُ يَدَيْه فِي الْمَاءِ فَيَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ وَيَقُولُ : لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ إِنَّ لِلْمَوْتِ لَسَكَرَاتٍ﴾(٢) .

**واتە** : کاتێ پێغەمبەر ﷺ کەوتە سەرەمەرگ و ئاویلکەو گیانەلاو، لە مردن نزیك بۆوە، هەردوو دەستەکانی خۆی

---

(١) البخاري ٧/ ١٠ ومسلم ٤/١٨٩٣ .

(٢) البخاري مع الفتح ٨/١٤٤ وفي الحديث السواك .

دەخستە نێو ئاو، بە هەردوو دەستەكانی دەم و چاوی خۆی تەڕ دەكردو دەستی بەسەردا دێناو دەیگوت، هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله)، بەڕاستی مردن تاڵی و ناسۆری و ژان و ئازاری خۆی هەیە.

٣/١٥٢- ﴿لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ ﴾ (١) .

واتە : هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی كە (الله)یە، خوای هەرە گەورەیە، هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی كە (الله)یەو تاك و تەنیایە، هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایە نەبێ كە (الله)یەو، خوایەكی تاك و تەنیاو بێ شەریك و هاوەڵە، هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی (الله)یە، هەموو موڵك و دەسەڵات و سوپاس و ستایشێك هەر بۆ ئەوە، هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله)، وە هیچ هێزو تواناو دەسەلآتێكیش نیە تەنها بەخوا (الله) نەبێت.

---

(١) أخرجه الترمذي وابن ماجه وصححه الألباني، انظر، صحيح الترمذي ١٥٢/٣ وصحيح ابن ماجه ٣١٧/٢ .

## ٥٢- تەلقینی ئەوکەسەی لەسەرەمەرگدایە

١٥٣- ﴿مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ﴾ [(١)] .

پێویستە ئەو کەسەی کە لەسەرەمەرگ و کاتی گیان کێشانە، هەمیشە بڵێ (لا الـه الا الله) هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله) نەبێ، یا یەکێك فێری (الله)ی بکاو بەنەرم و نیانی و بەلەسەرخۆیی ئەوەی بەبیرو هۆش بێنێتەوە، چونکە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێ: هەرکەسێ دوا وتەی ژیانی بریتی بێ لە (لا الە الا الله) دەچێتە بەهەشتەوە، بەمەرجێ ماناى بزانێ و بڕوای پێبێ و بەکردەوە جێ بەجێی بکات .

## ٥٣- دوعای کەسێك تووشی دەردو بەڵایەك دەبێت

١٥٤- ﴿إِنَّا للهِ وإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ اللهمَّ أُؤجُرنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْراً مِنْهَا﴾ [(٢)] .

---

(١) أبو داود ١٩٠/٣ وانظر، صحيح الجامع ٤٣٢/٥ .

(٢) مسلم ٦٣٢/٢ .

**واته** : ئێمه هەموومان هی خواین، وەهەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، خوایه خێرو پاداشتم بدەوەو خێر بارم بکه لەو دەردوبەلایەی که تووشت کردم و پێت تاقی کردمەوە، باشتر لەوەم بۆ جێبێلەو بۆم پڕ بکەوە .

## ٥٤- دوعای کاتی داخستنی چاوی مردوو

١٥٥- ﴿اللهمَّ اغْفِرْ لِفُلاَنٍ (باسْمه) وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي الْمَهْدِيِّينَ، وَاخْلُفْهُ فِي عَقِبِهِ فِي الْغَابِرِينَ، وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ يَا رَبَّ الْعَالَمِينَ، وَافْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ﴾ (١) .

**واته** : خوایه له فلان کەس خۆش به (ناوی دێنیّ)، پلەو پایەی لەناو ڕێنمایی کراوانت بەرز بکەوە، خوایه کەسێکی دڵسۆزو شایستەی لەنێو کەس و کارو خانەوادەکەیدا جێبێلە، ئەی پەروەردگاری جیهانیان له ئێمەو لە ئەویش خۆشبە، خوایه گۆڕی بۆ فراوان و گوشاد و ڕوناك بکه .

---

(١) مسلم ٢/٦٣٤

## ٥٥- دوعا کردن بۆ مردوو لەکاتی نوێژ لە سەرکردندا

١٥٦/١- ﴿اللهمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ، وَعَافِه، وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَأَغْسِلْهُ بِالْمَاءَ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَاراً خَيْراً مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلاً خَيْراً مِنْ أَهْلِهِ — وَزَوْجاً خَيْراً مِنْ زَوْجِهِ وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ (وَعَذَابِ النَّارِ)[١] ﴾ .

**واتە : خوایە لەم مردووە خۆشبە، ڕەحمی پێ بکە، سەلامەت و پارێزراوی بکە، لێی خۆش بەو، لە شوێنێکی بەرزو بەرێزی دابنێ و شوێنی بۆ فراوان بکە، خوایە بە ئاو و بەفرو تەزرە بیشۆرە، لەهەڵەو تاوانەکان پاکی بکەوە، هەروەك جل و بەرگی سپی لە چلك و کرێژ پاك دەبێتەوە، خوایە ئەم خانوەی دونیای بەخانوێکی باشتری دوا ڕۆژ بگۆڕەوە، خەڵك و خاوخێزانی دوارۆژی لەهی دونیا باشتر بێ، هاوسەری لە هاوسەری دونیا باشتر بێ، خوایە بیخەیتە ناو بەهەشت، لە**

(١) مسلم ٦٦٣/٢ .

سزاو ئازاری ناو گۆڕو ئاگری دۆزەخی بپارێزە.

١٥٧- ﴿اللهمَّ اغْفرْ لحيِّنا وَميِّتنا، وَشَاهدنَا وَغَائبنا، وَصَغيرنَا وَكَبيرنَا، وَذَكَرنَا وَأُنْثَانَا، اَللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ منَّا فَأَحْيه عَلَى الإِسْلاَم، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ منَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِيمَان، اَللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ وَلاَ تُضلَّنَا بَعْدَهُ﴾[1] .

**واتە** : **خوایە لە زیندوو و مردوومان، لە دیارو نادیارو ئامادەو بزرمان، لە بچوك و گەورەمان، لە نێرو مێمان خۆشبە، خوایە ئەوەی کە لێمان دەژێنی لەسەر ئیسلام بیژێنە، ئەوەی کە لێمان دەمرێنی لەسەر ئیمان بیمرێنە، خوایە لە خێرو پاداشتی ئەم دەردو بەڵاو تاقی کردنەوەیە بێ بەشمان نەکەی، لەدوای ئەوە گومڕامان نەکەی .**

١٥٨- ﴿اَللَّهُمَّ إِنَّ فُلاَنَ بْنَ فُلاَنٍ في ذمَّتكَ، وَحَبْلِ جَوارِكَ، فَقه منْ فتْنَة الْقَبْرِ وَعَذَاب النَّارِ، وَأَنْتَ أَهْلُ الْوَفَاءِ وَالْحَقِّ، فَاغْفرْ لَهُ

---

(١) ابن ماجه ١/٤٨٠ وأحمد ٢/٣٦٨، وانظر، صحيح ابن ماجه ١/٢٥١ .

وَارْحَمْهُ إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ (١) .

واته : خوایه فلانی کوڕی فلانی (ناوی دێنی) لە ژێر چاودێری و پارێزگایی و تۆدایە، لە ناشوب و ئاژاوەو ناخۆشیەکانی گۆڕو سزای دۆزەخی بپارێزە، خوایە تۆ خاوەن هەق و وەفای، خوایە لێی خۆشبەو ڕەحمی پێ بکە، هەر تۆ لێخۆشبەرو بەڕەحمی.

١٥٩- ﴿اللهمَّ عَبْدُكَ وَابْنُ أَمْتِكَ احْتَاجَ إِلَى رَحْمَتِكَ، وَأَنْتَ غَنِيٌّ عَنْ عَذَابِهِ، إِنْ كَانَ مُحْسِناً فَزِدْ فِي حَسَنَاتِهِ، وَإِنْ كَانَ مُسِيئاً فَتَجَاوَزْ عَنْهُ﴾ (٢) .

واته : خوایە ئەو مردووە بەندەی تۆیە، کوڕی کەنیزە، بەندەی تۆیە، پێویستی بە سۆزو بەزەیی تۆیە، خوایە تۆ بێ نیازی لە سزادانی وی و هیچ پێویستت بە سزادانی ئەو نیە،

---

(١) أخرجه ابن ماجه، انظر، صحيح ابن ماجه ٢٥١/١ ورواه أبو داود ٢١١/٣.

(٢) أخرجه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي ٣٥٩/١ وانظر، أحكام الجنائز للألباني ص ١٢٥ .

ئەگەر بەندەیەکی چاکە ئەوا لە چاکەکانی زیاد بکە، ئەگەر خراپ و تاوانبارە، ئەوا لێی ببوورە .

## ٥٦- دوعا کردن بۆ کۆرپەلەو منداڵ لەکاتی نوێژی مردوو لەسەرکردنی

١٦٠/١- ﴿اللهمَّ أعذْهُ منْ عَذَابِ الْقَبْرِ)[١] .

وَإنْ قَـالَ : (اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ فَرَطاً وَذُخْراً لِوَالِدَيْه، وَشَفِيعاً مُجابـاً، اللَّهُمَّ ثَقِّلْ بِهِ مَوَازِينَهُمَا وَأَعْظِمْ بِهِ أُجُورَهُمَا، وَأَلْحِقْهُ بِـصَالِحِ الْمُؤْمنينَ، وَاجْعَلْهُ فِي كَفَالَةِ إِبْرَاهِيمَ، وَقِهِ بِرَحْمَتِـكَ عَـذَابَ الْجَحيمِ، وَأَبْدِلْهُ دَاراً خَيْراً مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلاً خَيْراً مِنْ أَهْلِهِ، اللهمَّ

---

(١) (سەعیدی کوڕی (المسیب) گوتی لەپشت ئـەبو هـورەیرەوە نوێـژی مـردووم لەسـەر منداڵێك کرد هەرگیز گوناهێك چییە نـەیکردبوو، گـوێم لەئـەبو هریرە بوو دەیگوت..) فەرموودەکە.

أخرجه مالك في الموطا ٢٨٨/١ وابـن أبـي شـيبه في المصنف ٢١٧/٣ والبيهقـي ٩/٤، وصحح إسناده شعيب الأرناؤوط في تحقيقه لشرح السنة للبغوي ٣٥٧/٥ .

اغْفرْ لأَسْلافِنَا، وَأَفراطِنَا، وَمَنْ سَبَقَنَا بِالإيمَانِ) فَحَسَنٌ[1].

**واته** : خوایە لە سزاو ئازاری گۆڕ بیپارێزە، ئەگەر دەڵێ : خوایە بیکە توێشو و پاداشتێك بۆ دایك و باوكی، بیكە تكا كارێكی داوا وەرگیراو، خوایە بەهۆی ئەوە تەرازوی خێرو چاكەیان گران و تەژیكە، خێرو پاداشتیان زۆرو زەوەند بكە، خوایە بە ئیمانداره چاكەكانی بگەیەنەوە، لەژێر سەرپەرشتی حەزرەتی ئیبراهیمی دابنێ، خوایە بە بەزەیی خۆت لە سزای دۆزەخی بپارێزە، خوایە ماڵ و خانوو و خانەوادەی دونیای بۆ بەهی باشتر لەدوا ڕۆژ و لای خۆت بگۆڕیەوە، خوایە لە پێشینەكان و لە ڕابوردەكانمان خۆشبە، وە لەو كەسانەش خۆش بە كە بە ئیمان وە پێش ئێمە كەوتونە)ئەمەیان چاكە.

١٦١/٢- ﴿اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ لَنَا فَرَطاً، وَسَلَفاً، وأَجْراً﴾[2].

---

(١) انظر، : المغني لابن قدامة ٤١٦/٣ والدروس المهمة لعامة الأمة للشيخ عبدالعزيز بن عبدالله بن باز، ص ١٥ .

(٢) ئیمامی حەسەن سورەتی فاتیحەی لەسەر منداڵی مردوو دەخوێندو دەیگوت..) فەرموودەكە، أخرجه البغوي في شرح السنة ٣٥٧/٥ و عبدالرزق برقم ٦٥٨٨، وعلقه البخاري في كتاب الجنائز، ٦٥ باب قراءة فاتحة الكتاب على الجنازة ١١٣/٢ .

**واتە:** خوایە ئەم منداڵە مردووە بۆمان بکەیتە پاداشت و تێشوو خێرو پێشباری چاك لەدوا ڕۆژدا .

## ٥٧- دوعای سەرە خۆشی لێکردن

١٦٢- إِنَّ للهِ مَاأَخَذَ وَلَهُ ماأَعْطَى وَكُلُّ شَـيْءٍ عِنْـدَهُ بِأَجَـلٍ مُسَمًّى . . . . فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ [1] .

وَإِنْ قَالَ : أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ، وَأَحْسَنَ عَزَاءَكَ وَغَفَـرَ لِمَيِّتِـكَ فَحَسَنٌ [2] .

**واتە** : ئەوەی کە خوا دەیبا هی خوایە، وە ئەوەی کە دەشـیدا هەر هی خوایـە، هـەموو شـتێك لـەلای ئـەو بـە کـاتێکی دیاریکراو و بڕاوەیەو ماوەی ژیانی خۆی هەیـە، بۆیـە ئـارام بگـرەو ڕازیبـە بەقـەزاو قـەدەرو بـەو موسـیبەتە، تـاخێرو پاداشتت پێ بگات .

---

(١) البخاري ٢/ ٨٠ ومسلم ٢/٦٣٦ .

(٢) الأذكار للنووي ص ١٢٦ .

یا با بڵێ : (خوا خێرو پاداشتت بەهۆی ئەوە زۆر بکـا، خـوا سەرەخۆشیت چاك و جـوان بکـا، خـوا لـە مـردووت خـۆش بێت)، ئەوە چاکە .

## ٥٨- دوعای کاتی مردوو خستنە ناو گۆڕ

١٦٣- بِسْمِ اللهِ وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ [١].

واتە : بەناوی خوا، لەسەر سوننەت و ڕێبازی خوا .

## ٥٩- دوعای دوای شاردنەوەی مردوو

١٦٤- ﴿اللهمَّ اغْفِرْ لَهُ اللهمَّ ثَبِّتْهُ﴾ [٢] .

---

(١) أبو داود ٣/٣١٤ بسند صحيح وأحمد بلفظ بسم الله وعلى ملة رسول الله وسنده صحيح .

(٢) (کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لەنەسپاردکردنی مردوو ببایەوە لەسەری دەوەستاو دەیفەرموو: (داوای لێخۆشبوون بۆ براکەتان بکەنو خۆراگری و دامەزراویی بۆ بخوازن، چونکە ئەو ئێستا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ). أبو داود ٣/٣١٥ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ١/٣٧٠ .

**واتە** : خوایە لێی خۆشبە، خوایە خۆ ڕاگرو دامەزراوی بکە.

## ٦٠- دوعای سەردانی کردنی گۆڕەکان

١٦٥- السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ، مِنَ الْمُؤمنِينَ وَالْمُسْلمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاَ حقُون (وَيَرْحَمُ اللهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمَسْتَأخِرِينَ) أَسْأَلُ اللهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ [1] .

**واتە** : سەلامی خواتان لێبێ ئەی خەڵکی گۆڕەکان لە ئیماندارو موسڵمانان، بە ویستی خوا ئێمەیش بە ئێوە دەگەین، خوا ڕەحم بە پێشکەوتوەکانمان و بە پاشکەوتوەکانمان بکات، ئەوانەی کە پێش ئێمە مردوون، ئەوانەیش لە دوای ئێمە دەمرن، لە خوای گەورە بۆ خۆمان و بۆ ئێوەش داوای سەلامەتی و لێبوردن دەکەین .

---

(١) مسلم ٦٧١/٢، وابن ماجه واللفظ له ٤٩٤/١ عن بريدة، وما بين المعكوفين من حديث عائشة (خوای لێ رازی بێت) عند مسلم، ٦٧١/٢ .

## ٦١- دوعای كاتی با هەڵكردن

١٦٦/١- ﴿اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا﴾[1].

**واتە : خوایە داوای خێرو چاكەی ئەم بایەت لێدەكەم، بەتۆ خۆم لەزەرەرو زیان و خراپەی دەپارێزم .**

١٦٧/٢- ﴿أَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَها، وَخَيْرَ مَا فِيهَا، وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ مَا فِيهَا، وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ﴾[2] .

**واتە : خوایە داوای خێرو چاكەی ئەوەی كەبۆت ناردووە لێ دەكەم، وە بەتۆ خۆم لەزەرەرو زیان و خراپەی ئەم بایەو هەرچی تیایەتی و ئەوەی كەبۆت ناردووە دەپارێزم.**

---

(١) أخرجه أبو داود ٣٢٦/٤ وابن ماجه ١٢٢٨/٢ وانظر، صحيح ابن ماجه ٣٠٥/٢ .

(٢) مسلم ٦١٦/٢ والبخاري ٧٦/٤ .

## ٦٢- دوعای کاتی بروسك گرمەو هەورە تریشقە

١٦٨- ﴿سُبْحَانَ الَّذي يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالْمَلاَئِكَــةُ مِــنْ خِيفَتِهِ﴾ [1] .

**واتە** : پاكی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی كە هــەورە تریــشقە بــە گرمــە گرمــی خــۆی ســوپاس و ستایــشی خــوا دەكــا، فریــشتەكانیش لــەترس‌و بیمــی خــودا ســوپاس و ستایــشی دەكەن.

## ٦٣- هەندێ لە دوعاكانی كاتی باران نەبارین و داوای باران كردن

١٦٩/١- ﴿اللّهُمَّ أسْقِنَا غَيْثاً مُغيثاً مَريئاً مَريعاً، نَافِعاً غَيْرَ ضَارٍّ، عَاجِلاً غَيْرَ آجِلٍ﴾ [2] .

---

(١)(عەبدوڵڵای كــوڕی زوبێــر، كاتێــك گــوێی لەهــەورە تریــشقە بووایــە، وازی لەقسەكردن دەهێناو دەیگوت...) فەرموودەكە.
الحديث، الموطأ ٩٩٢/٢ وقال الألباني صحيح الإسناد موقوفاً .

(٢) أبو داود ٣٠٣/١ وصححه الألباني في صحيح أبو داود ٢١٦/١ .

**واتە** : خوایە ئاومان بدەو تێـر ئاومـان بکـە بـە بـارانێکی بـە لێزمەو بە خورِ، سەوزکەری گژو گیاو بەپیت و بەفەرو بەسـوودو بێ زیان بێ، هەر ئێستا بۆ مان ببارێنەو دوای مەخە .

٢/١٧٠- ﴿اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللهمَّ أَغِثْنَا اللهمَّ أَغِثْنَا﴾ [١] .

**واتە** : خوایە فریامان بکەوەو بارانمـان بـۆ ببارێنـە ، خوایـە فریامان بکەوەو بارانمان بۆ ببارێنە خوایە فریامـان بکـەوەو بارانمان بۆ ببارێنە .

١٧١- ﴿اللَّهُمَّ اسْقِ عِبَادَكَ، وَبَهَائِمَكَ، وَانْشُرْ رَحْمَتَكَ، وَأَحْيِي بَلَدَكَ الْمَيِّتَ﴾ [٢] .

**واتە** : خوایـە بەنـدەکانی خـۆت و گیانلەبـەرەکانی خـۆت ئاوبدەو تێر ئاویان بکە بـە بـارانێکی بـەپیت و بەرەحمـەت، خوایە رەحمەت و بەرەکەتی خۆت لەزەویدا پەرش‌و بلاّوبکەوە، خوایە خاك و ولاّتی مردووی خۆت ئاوەدان و زیندوو بکەوە .

---

(١) البخاري ٢٤٤/١ ومسلم ٦١٣/٢ .

(٢) أبو داود ٣٠٥/١ وحسنه الألباني في صحيح أبي داود ٢١٨/١ .

## ٦٤- دوعا كردنی كاتی باران بارین

١٧٢- ﴿اللهمَّ صَيِّباً نَافعاً﴾ [١] .

**واته** : خوایه ئەم بارانە بارانێكی بەسوودو بەفەڕ بێت .

## ٦٥- زیكری دوای باران بارین

١٧٣- ﴿مُطِرْنَا بِفَضْلِ الله وَرَحْمَتِه﴾ [٢] .

**واته** : بەفەزڵ و سۆزو بەخشش و ڕەحمەتی خوای گەورە ئاودراین و بارانمان بۆ باری و تێراوكراین .

## ٦٦- دوعای خۆشكردنەوەی باران

١٧٤- ﴿اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا، اللهمَّ عَلَى الآكَامِ وَالظِّرابِ، وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ، وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ﴾ [٣] .

---

(١) البخاري مع الفتح ٢/٥١٨ .

(٢) البخاري ١/٢٠٥ ومسلم ١/٨٣ .

(٣) لبخاري ١/٢٢٤ ومسلم ٢/٦١٤ .

**واتــه** : خوايــه بەڕەحمــەت و بەبەرەكــەت لەدەوروبــەرمان بباريّنه نەك لەسەرمان، ببيّته بـەلاو خەشم و زيانمـان پـێ بگێنێ، خوايه لەسەر گردو تەپۆلكەو قوتە شاخ و له دۆڵ و شيّوەكان و بۆ دارودرەختەكانى بباريّنه.

## ٦٧- دوعاى مانگ ديتن (هيلال)

١٧٥- الله أَكْبَرُ، اللهمَّ أهلَّهُ عَلَيْنَا بالأَمْنِ وَالإيمَان، وَالـسَّلاَمة وَالإسْلاَمِ، والتَّوفِيقِ لِمَا تُحِبُّ رَبَّنَا وَتَرْضَى، رَبُّنَا وَرَبُّكَ الله [1].

**واته** : خوا گەورەترە، خوايە ئەم مانگەمان لەسـەر هەڵێنـە بەخێرو خۆشى و ئاشـتى و ئيمـان و ئيـسلام و سـەلامەتى، بەدەستگرتن و سەرخستن و هاوكاريـت بـۆ ئـەو شـتەى كـە پـەروەردگارمان پێـى خۆشـەو پێـى ڕازيـيـە، ئـەى مــانگ ئاگاداريەو بزانە كە پەروەردگارى تۆو ئێمەيش تـەنها خـواى گەورەيە كە (الله)يە، تاك و تەنياو بێ شەريكە .

---

(١) الترمذي ٥/٥٠٤ والدارمي بلفظة ١/٣٣٦ وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٥٧.

## ٦٨- دوعای کاتی بەربانگ و ڕۆژو شکاندن

١٧٦/١- ﴿ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ، وَثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللهُ﴾ [(١)] .

**واتە** : ئەو تینوەتیەی کە هەمان بوو ڕۆیشت و ڕەویەوە، دەمارە تینوو چرچەکان تەڕ بورنەوەو بووژانەوە، ئەگەر خواش حەز بکا خێرو پاداشتیشمان مسۆگەرو چەسپاوە .

١٧٧/٢- ﴿اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِرَحْمَتِكَ الَّتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ أَنْ تَغْفِرَ لِي﴾ [(٢)] .

**واتە** : خوایە من بەو ڕەحمەتەت کە هەموو شتێکی گرتۆتەوەو داپۆشیوە داوات لێدەکەم کە لێم خۆش بیت .

---

(١) أخرجه أبو داود ٣٠٦/٢ وغيره صحيح الجامع ٢٠٩/٤ .

(٢) أخرجه ابن ماجه ٥٥٧/١ من دعاء عبدالله بن عمرو، وحسنه الحافظ في تخريج الأذكار انظر، شرح الأذكار ٣٤٢/٤.

## ٦٩- دوعای پێش نان خواردن

٣/١٧٨- ﴿إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَاماً فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللهِ، فَإِنْ نَسِيَ فِي أَوَّلِهِ فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللهِ فِي أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ﴾ [(١)] .

**واته : ئەگەر یەكێك لە ئێوە خوارد نی خوارد با بڵێ : بەناوی خوا، جا ئەگەر لەسەرەتادا ئەوەی لەبیرچوو با بڵێ : بەناوی خوا سەرەتاو کۆتایی.**

٤/١٧٩- ﴿مَنْ أَطْعَمَهُ اللهُ الطَّعَامَ فَلْيَقُلْ اللهمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَأَطْعِمْنَا خَيْراً مِنْهُ وَمَنْ سَقَاهُ اللهُ لَبَناً فَلْيَقُلْ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ﴾ [(٢)] .

**واته : هەر کەسێك خوای گەورە خواردن و خۆراکێکی پێدا با بڵێ : خوایە بەرەکەتمان بۆ تیا بخەی، هەمیشە چاکتر لەو خواردن و خۆراکەمان پێ بدەی، ئەگەر یەکێك شیری**

---

(١) أخرجه أبو داود ٣٤٧/٣ والترمذي ٢٨٨/٤ وانظر: صحيح الترمذي ١٦٧/٢.

(٢) الترمذي ٥٠٦/٥ وانظر، صحيح الترمذي ١٥٨/٣ .

خواردەوە، با بڵێ : خوایە بەرەکەتمان بۆ تیابخەو بۆمان زیاد بکەی.

## ٧٠- دوعای دوای خواردن

١٨٠/١- ﴿الْحَمْدُ للهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ﴾[1].

**واتە :** سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کەبەبێ هێزو تواناو دەسەڵاتی خۆم، ئەم خواردن و خۆراك و رزق و رۆزییەی دەرخوارد دام.

١٨١- ﴿الْحَمْدُ للهِ حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ، غَيْرَ (مَكْفِيٍّ وَلاَ) مُوَدَّعٍ، وَلاَ مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا﴾ [2].

**واتە :** سوپاس و ستایشێکی زۆر چاك و پاك و پیرۆز بۆ خوای گەورە، خوایە پیت و بەرکەت بخەیتە ئەم خواردنە، بە

(١) أخرجه أصحاب السنن إلا النسائي وانظر،صحيح الترمذي ١٥٩/٣.

(٢) البخاري ٢١٤/٦ والترمذي بلفظه ٥٠٧/٥.

**جۆرێ كه نەیبڕی و لێی نەگەڕێ و وازی لێ نەینی، خوایە ئێمە لەو خواردنە بێ نیازو بێ منەت نەكەی .**

## ٧١- دوعای میوان بۆ خاوەن ماڵ

١٨٢- ﴿اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِيمَا رَزَقْتَهُمْ وَاغْفِرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ﴾[1] .

**واتە : خوایە ئەوەی كە بەخشیویانەو دەرخواردیان داین، بۆیان بەپیت و پیرۆز بكەو بەرەكەتیان بۆ تێ بخەی، خوایە لێیان خۆش بی و ڕەحمیان پێ بكەیت .**

## ٧٢- دوعا كردن بۆ كەسێك كە ئاوت دەداتێ

١٨٣- اللهمَّ أَطْعِمْ مَنْ أَطْعَمَنِي وَاسْقِ مَنْ سَقَانِي [2] .

**واتە : خوایە خواردن بدە ئەو كەسەی كە خواردنم پێ دەدا، ئاو بدە ئەو كەسەی كە ئاوی بە مندا.**

---

(١) مسلم ٣/١٦١٥ .

(٢) مسلم ٣/١٢٦ .

## ٧٣- دوعای بەربانگ شکاندن لەماڵێك

١٨٤- أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائمونَ، وَأَكَلَ طَعَامَكُمْ الأَبْـرارُ ـــ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئكَةُ [١] .

**واتە** : **ڕۆژووەوانان لەلاتان بەربانگیان کردەوە، خەڵکی چاك خواردنتانیان خوارد، فریشتەکانی خوا دوعاتان بۆ بکەن، لەخوا بۆتان بپاڕێنەوەو داوای لێخۆشبوون تان بۆ بکەن .**

## ٧٤- دوعای ڕۆژووەوان کاتێ کە خواردن دادەنرێ و هێشتا ڕۆژووی نەشکاندووە

١٨٥- (إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كَانَ صَائماً فَلْيُصَلِّ وَإِنْ كَانَ مُفْطِراً فَلْيَطْعَمْ )[٢] وَمَعْنَى فَلْيُصَلِّ أيْ فَلْيَدْعُ.

---

(١) سنن أبي داود ٣٦٧/٣، وابن ماجه ٥٥٦/١ والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم ٢٩٦-٢٩٨، پێغەمبەر ﷺ نەگەر لەماڵێکدا فتاری بکردابوایە، وای دەفەرموو وصححه الألباني في صحيح أبي داود ٧٣٠/٢ .

(٢) مسلم ١٠٥٤/٢

**واتە** : ئەگەر یەکێك لە ئێوە داوەت کرا با بچێ، ئەگەر بە ڕۆژوو بوو با دوعای خێر بکا، ئەگەر بە ڕۆژووش نەبوو، با خواردن و داوەتەکە بخوا .

## ٧٥- ڕۆژووگر چی دەڵێ ئەگەر جنێویان پێدا

١٨٦- (إِنِّي صَائِمٌ، إِنِّي صَائِمٌ) (١) .

**واتە** : ڕۆژووگر لەو کاتە دەڵێ ( من بەڕۆژووم، من بە ڕۆژووم ) پێویستە هەر گیز بەخراپ وەڵامیان نەداتەوە .

## ٧٦- دوعای کاتی بینینی نۆبەرەی میوەجات

١٨٧- ﴿اللهمَّ بَارِكْ لَنَا فِي ثَمَرِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي مُدِّنَا﴾ (٢) .

---

(١) البخاري مع الفتح ٤/١٠٣ ومسلم ٢/٨٠٦ .

(٢) مسلم ٢/١٠٠٠

**واتە** : خوایە بەرەکەت بخەیتە بەروبوم و میوەجاتمان، خوایە شارو ولاتمان پاك و پیرۆز بکەی، خوایە بەرەکەت بخەییە مشت و رِبەو کێش و پێوانەمان .

## ٧٧- دوعای پژمین

١٨٨- ﴿إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ الْحَمْدُ للهِ، وَلْيَقُلْ لَهُ أَخُوهُ أَوْصَاحِبُهُ : يَرْحَمُكَ اللهُ، فَإِذَا قَالَ لَهُ : يَرْحَمُكَ اللهُ، فَلْيَقُلْ : يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُم﴾ [١].

**واتە** : ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی با بڵێ : سوپاس بۆ خوا، ئەوەی کە لەلایەتی با بڵێ : خوا رِەحمەت پێ بکا، ئەوسا ئەویش با پێی بڵێ : خوا هیدایەتتان بداو حاڵ و باڵتان چاك و باش بکات .

---

(١) البخاري ١٢٥/٧.

## ٧٨- چی بەکافر دەگوترێ ئەگەر پژمی و سوپاسی خوای کرد

١/١٨٩- ﴿يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ﴾ [١] .

**واتە** : پێی دەگوترێ، خوا هیدایەتت بداو حال و بالت چاك و باش بكات .

## ٧٩- دوعا بۆ کەسێك ژنی مارە کردووە

١٩٠- ﴿بَارَكَ اللهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ﴾[٢] .

**واتە** : خوا بەرەکەت بخاتە ژن مارەکردنەکەت و لێت پیرۆز بکاو لەسەرت پیرۆز بکا، خوا هەردووکتان لە خێرو خۆشی و کامەرانیدا کۆ بکاتەوەو ژیانێکی پڕ لە ئاسوودەیی بەسەر بەرن .

---

(١) الترمذي ٨٢/٥ وأحمد ٤٠٠/٤ وأبو داود ٣٠٨/٤، وانظر : صحيح الترمذي ٣٥٤/٢ .

(٢) أخرجه أصحاب السنن النسائي وانظر، صحيح الترمذي ٣١٦/١ .

## ٨٠- ئەو کەسەی ژنی مارە کردووە یا وڵاخە بەرزەیەکی کڕیوە چ دوعایەك بۆ خۆی دەکات

١٩١- ﴿إِذَا تَزَوَّجَ أَحَدُكُمْ امْرَأَةً، أَوْ إِذَا اشْتَرى خَادِماً فَلْيَقُلْ : اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ، وَإِذَا اشْتَرَى بَعِيراً فَلْيَأْخُذْ بِذِرْوَةِ سَنَامِهِ وَلْيَقُلْ مِثْلَ ذلِكَ﴾ (١) .

**واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە ژنێکی مارە کرد، یا وڵاخ و خزمەتکارێکی کڕی با بڵێ، خوایە داوای خێرو چاکەی ئەوەو ئەوەی کە پێی هاتووە لێ دەکەم، خوایە خۆم دەپارێزم بەتۆ لە زەرەرو زیان و خراپەی ئەوەو ئەوەی کە ئەوە لەسەری هاتووەو لەبۆی هاتووە، وە ئەگەر وشترێکی کڕی با دەستی دە شوێنی هەرە بەرزی بگری کە سەر پشت و تەوقی سەریەتی و هەمان شت بڵێ.**

(١) أبو داود ٢٤٨/٢ وابن ماجه ٦١٧/١ وانظر، صحيح ابن ماجه ٣٢٤/١ .

## ٨١- دوعای پێش چوونە لای خێزان و جیماع کردن

١٩٢- ﴿ بِسْمِ اللهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَارَزَقْتَنَا ﴾ (١).

**واتە : بەناوی خوای گەورە، خوایە شەیتان لەئێمە دوور بخەیتەوە، وە شەیتان دوور بخەوە لەوەش کە پێمان دەبەخشی.**

## ٨٢- دوعای کاتی تووڕە بوون

١٩٣- أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ (٢).

**واتە : خوایە بەتۆ خۆم دەپارێزم لە شەیتانی بەدو نەفرەت لێکراو .**

## ٨٣- دوعای ئەو کەسەی کەسێکی بە بەڵاو تاقی کراوە دەبینێت

١٩٤- الْحَمْدُ للهِ الَّذي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلاَكَ بِهِ وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ

---

(١) البخاري ٦/١٤١ ومسلم ٢/١٠٢٨ .

(٢) البخاري ٧/٩٩ ومسلم ٤/٢٠١٥ .

مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلاً [1] .

**واتە** : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە منی ساغ و سەلامەت و بێ وەی کردەوە، لەوەی کە تۆی پێ بەڵادارو تاقی کردۆتەوە، بەفەزڵ و چاکەی خۆی منی بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانیدا پەسەند کردووە.

## ٨٤- ئەوەی لە کۆڕو دانیشتن دا دەگوترێت

١٩٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنه) قَالَ : كَانَ يُعَدُّ لِرَسُولَ اللهِ ﷺ فِي الْمَجْلِسِ الْوَاحِدِ مِائَةُ مَرَّةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَقُومَ (رَبِّ اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الْغَفُورُ) [2].

**واتە** : لە عبدالله ی کوڕی ئیمامی عومەر دەگێڕنەوە دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ لەیەك کۆڕو دانیشتندا پێش ئەوەی هەستێ، (١٠٠)جار دەیگووت : خوایە لێم خۆشبە، تۆبەم لێ قەبوڵ بکە، چونکە هەر تۆ تەوبە قەبول دەکەی .

---

(١) الترمذي ٤٩٤/٥ و ٤٩٣/٥ وانظر، صحيح الترمذي ١٥٣/٣ .

(٢) الترمذي وغيره، وانظر، صحيح الترمذي ١٥٣/٣ وصحيح ابن ماجه ٣٢١/٢ ولفظه الترمذي .

## ٨٥- کەفارەتدانی کۆڕ و دانیشگەکان.

١٩٦- ((سُبْحَانَكَ اللَّهُم وَ بِحَمْدِكَ، أشْهَدُ أن لا إلَهَ إلاَّ أنْتَ، أسْتَغْفِرُكَ وأتوبُ إلَيْكَ))[1].

**واته: خوایه پاکیو بێ گەردی و سوپاس و ستایش بۆ تۆی بەرزو بەرێز، گەواهی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە تەنها تۆ نەبێت، داوای لێخۆش بوون لەتۆ دەکەم، وەهەر بۆلای تۆش دەگەڕێمەوە تەوبە دەکەمو پەشیمان دەبمەوە.**

---

(١) ( لەفەرموودەدا هاتورەو چەسپاوەکە عائیشە دایکی ئیمانداران (خوالێی رازی بێ) گوتوویەتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەهەر کۆڕێك دانیشتبێ، هەرجارێك قورئانی خوێندبێ، هەر نوێژێکیشی کردبێ، ئەوا هەردەم بەو چەند وشەیە کۆتایی پێ دەهێنان.. فەرموودەکە.

اخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة برقم ٣٠٨، واحمد ٧٧/٦ وصححه الدكتور فاروق حمادة في تحقيقه لعمل اليوم والليلة للنسائي، ص٣٧٢.

## ٨٦- دوعا كردن بۆ ئەو كەسەی كە پێت دەڵێ خوا لێت خۆش بێت

١٩٧- (وَلَكَ)[١].

سوننەتە تۆش بەو كەسە بڵێی : خوا لەتۆش خۆش بێت .

## ٨٧- دوعا كردن بۆ كەسێك چاكەت لەگەڵدا دەكات

١٩٨- ﴿جَزَاكَ اللهُ خَيْراً﴾ [٢] .

واتە : خوا پاداشتی خێرو چاكەت بداتەوە .

## ٨٨- ئەوەی كە خوا مرۆڤی پێ لە دەججال دەپارێزێ

١٩٩- ﴿مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُـــصِمَ

(١) أحمد ٥/٨٢ والنسائي في عمل اليوم والليلة ص ٢١٨ برقم ٤٢١ تحقيق الدكتور فاروق حمادة .

(٢) أخرجه الترمذي رقم ٢٠٣٥ وانظر، صحيح الجامع ٦٢٤٤ وصحيح الترمذي ٢/٢٠٠ .

مِنَ الدَّجَّالِ﴾[1]

**واته** : هەركەسێ (١٠)ئایەت لەسەرەتای سورەتی (الكهف) لەبەر بكا، خوای گەورە لە شەڕو شۆڕو ئاشوب و ئاژاوەی دەججالی دەپارێزێ كە بریتییە لە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ مَّـٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا ﴿٣﴾ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴿٤﴾ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِـَٔابَآئِهِمْ ۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾ فَلَعَلَّكَ بَـٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا بِهَـٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ

---

(١) مسلم ١/٥٥٥ وفي رواية من آخر الكهف ١/٥٥٦ .

زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُواْ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ ﴾ (سورة الكهف).

**واته:** سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە قورئانی دابەزندۆتە سەر موحەممەدی بەندەی خۆی، ئەو قورئانەی کەهیچ جۆرە هەڵەو خواری‌و خێچی‌و کەموکوڕییەکی تیا نییە، بەڵکو قورئانێکی زۆر تێرو تەواو رێك پێك‌و رەوایە، تا لەلای خۆیەوە ئەو کەسانەبەسزایەکی توندو بەتین بترسێنێ کەبڕوایان پێی نییە، وەمژدەش بداتە ئەو ئیماندارانەی کەکارو کردەوەی چاك دەکەن، بەوەی کەخێرو پاداشتێکی زۆر چاك‌و نەبڕاوەیان بۆ هەیە کەبریتییە لە بەهەشت، کە بەهەمیشەیی تیایدادەمێننەوەو گوزەر دەکەن، وەبۆ ئەوەی ئەوکەسانەش بترسێنێ کە دەیانگوت خوا

مندالّی هەیە، کەچی نەخۆیان نەباب و باپیرانیان هیچ زانستو زانیاریەکیان بەوەنەبووە، بۆیە ئەوە قسەو بوهتانێکی زۆر گەورەیەکەلەزارو دەمیان دێتە دەرەوە بەرانبەر بەخوای گەورە دەیکەن، چونکە ئەوە تەنها درۆیەکە دەیلێن، ئەی موحەممەد خەریکە لەبەرکارو کردەوەی بەدی ئەوانە خۆت لەناوبەری، یائەگەر ئیمان بەم قورئانە نەهێنن خۆت بکوژی، وامەکە، بەڕاستی ئەوەی کەئێمە لەسەر زەویدا دامان ناوەو زەوی مان پێ ڕازاندۆتەوەو، خێرو خۆشیمان بەخەڵك داوە، بۆئەوەیە تاخۆ کامەتان باشترین کارو کردەوە دەکەن، دەنا ئەوەی کەلەسەر ئەم زەویەیە لەمەودوا هەمووی دەکەینە زەویەکی تەختو وشكو بریشكو رووتەن، ئایا نەتزانی ئەو هاوەڵانەی کەلەبەر بێدینی دارو دەسەڵاتی دونیا پەنایان بردە بەر ئەشکەوتەکەو ناویان لەتابلۆیەکی بەردیندا نووسرا، بوونە یەکێك لە بەڵگەو نیشانە سەیرو سەمەرەکانی ئێمە، کاتێ کۆمەڵە گەنجێك پەنایان بردەبەر ئەشکەوتەکەو وتیان: خوایە لەلایەنخۆتەوە رەحمەتێکمان پێببەخشە، وەرێگە چارەیەکیشمان بۆ فەراهەم

بێنه لەو کارو ژیانەی کەتیایداین، تاقوتارمان ببێت.
وە پەنا گرتن بە خوای گەورە لە ئاشوب و ئاژاوەی دەجال لەدوای تەحیاتی کۆتایی لە هەموو نوێژێك، واتە : خوێندنی دەقی (اللهم إني اعوذبك من عذاب القبر ومن عذاب النار ومن فتنة المحيا والممات ومن فتنة المسيح الدجال) .

## ٨٩- دوعاکردن بۆ ئەو کەسەی کە پێت دەڵێ من لەبەر خوا تۆم خۆش دەوێ

٢٠٠- أَحَبَّكَ الَّذي أَحْبَبْتَني لَهُ [1] .

**واتە** : یاخوا ئەو خوایە تۆی خۆش بوێ کە تۆ لەبەر ئەو منت خۆش دەوێت .

(١) أخرجه أبو داود ٣٣٣/٤، وحسنه الألباني في صحيح سنن أبي داود ٩٦٥/٣.

## ٩٠- دوعا كردن بۆ ئەو كەسەی سامانی خۆت پیشان دەدات

٢٠١- بَارَكَ اللهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ [١]

**واتە** : خوا بەرەكەت بخاتە مالّ و خانـەوادەت، لێتـی پـیرۆز بكات .

## ٩١- دوعا كردن بۆ خاوەن قەرز لەكاتی قەرز دانەوەی

٢٠٢- بَارَكَ اللهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، إِنَّمَا جَـزَاءُ الـسَّلَفِ الْحَمْدُ وَالأَدَاءُ [٢].

**واتە** : خوا بەرەكەت بخاتە سەرو مـالّ و خێزانـت، بەڕاسـتی خێرو پاداشتی قەرزدەر هەر سوپاس كردن و قەرز پێدانـەوەو دوعا بۆ كردنە .

---

(١) البخاري مع الفتح ٨٨/٤ .

(٢) أخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة ص ٣٠٠ وابن ماجه ٨٠٩/٢ وانظر، صحيح ابن ماجه ٥٥/٢ .

## ٩٢- دوعای لەشیرك ترسان

٢٠٣-اللهمَّ إنِّي أَعُوذُبِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لاَ أَعْلَمُ[1].

واتە : خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لەوەی کە شەریکت بۆ پەیدا بکەم، بشزانم کەئەوە شیرکە، داوای لێخۆشبونت لێ دەکەم لەوەی کە نایزانم شیرکەو دەیکەم .

## ٩٣- دوعا کردن بۆ ئەو کەسەی پێت دەڵێت خوا ئەو شتەت لێ پیرۆز بکات

٢٠٤- وَفِيْكَ بَارَكَ اللهُ[2] .

واتە : دەبێ تۆش لەبەرانبەردا پێی بڵێی : خوا لەتۆش پیرۆز بکات .

---

(١) أحمد ٤٠٣/٤ وغيره وانظر، صحيح الجامع ٢٣٣/٢ وصحيح الترغيب والترهيب للألباني ١٩/١.

(٢) أخرجه ابن السني ص ١٣٨ برقم ٢٧٨ وانظر، الوابل الصيب لابن القيم ص ٢٠٤ تحقيق بشير محمد عيون .

## ٩٤- دوعای وەلانان و بێزاندنی شومی و ڕەشبینی

٢٠٥- ﴿اللهمَّ لاَ طَيْرَ إلاَّ طَيْرُكَ، وَلاَ خَيْرَ إلاَّ خَيْرُكَ، وَلاَ إلَـهَ غَيْرُكَ﴾ [1] .

**واته : خوایە هیچ باڵندەو مەترسی و ڕەشبینیەك نیە تەنها هی تۆ نەبێ، خوایە هیچ خێرو خۆشی و چاکەیەك نیە تەنها هی تۆ نەبێ، هیچ خوایەکی بەهەق نیە جگە لەتۆ .**

## ٩٥- دوعای سواربوون

٢٠٦-بِسْمِ اللهِ، الْحَمْدُ للهِ ﴿سُبْحَنَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذا وَمَا كُنَّا

---

(١) بەڵام سەبارەت بە(فأل) کەبەمانای قسەی خۆش و مژدەی دڵخۆشکەردێ ( وەکوو ئەوەی نەخۆشێك بەڵەش ساغو تەندروست بانگ بکەی) ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) زۆر حەزی پێ دەکرد، هەرلەبەر ئەمەش جارێکیان قسەیەکی خۆشی لەپیاوێك گوێ لێ بوو، کەیفی پێ هاتو فەرمووی (قسە خۆشەکەتان لەزاری خۆتەوە وەرگرت). أحمد ٢/ ٢٢٠ وابن السني برقم ٢٩٢ وصححه الألباني في الأحاديث الصحيحة ٣/ ٥٤، رقم ١٠٦٥ وصححه الألباني في الأحاديث الصحيحة ٣/ ٥٤، رقم ١٠٦٥، أبو داود وأحمد، وصححه الألباني في الصحيحة ٢/ ٢٦٣ عند أبي الشيخ في أخلاق النبي ﷺ ص ٢٧٠ .

لَهُ مُقْرِنينَ وَإِنَّآ إلى رَبِّنا لَمُنقَلِبُونَ﴾ (الْحَمْـــدُ للهِ، الْحَمْـــدُ للهِ الْحَمْدُ للهِ، اللهُ أَكْبَرُ،اللهُ أَكْبَرُ،اللهُ أَكْبَرُ،سُبْحَانَكَ اللهمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفسِي فَاغْفِرْ لِي، فإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُالذُّنوبَ إلاَّ أَنْتَ)(١).

**واته** : بەناوی خوا، سوپاس بۆ خوا، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەوەی بۆ ڕام و ژێــر دەســتە کــردووین، ئەگــەرنا هیچ دەسەڵاتێکمان بەسەریدا نیەو نـەمان دەتـوانی سـواری بین، ئێمە لە ڕۆژی دوایی بەرەو پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە بۆ حەشــرو حیــساب و لێپرســینەوەمان، ســوپاس بــۆ خــوا، سوپاس بــۆ خــوا، ســوپاس بــۆ خــوا، خــوا گــەورەترە، خــوا گەورەترە، خوا گەورەترە، خوایە پــاکی و بێگــەردی بــۆ تــۆ، بەڕاستی من ستەمم لەخۆم کرد بەهۆی ئەو گوناهانەی کـە کردم، خۆم شایستەی دۆزەخ و خەشـم و نـاڕەزایی تـۆ کـرد، دەلێم خۆشبە، چونکە هــیچ کـەس لـە گونـاه و تاوانـەکان خۆش نابێت تەنها تۆ نەبێت .

---

(١) أبو داود ٣٤/٣ والترمذي ٥٠١/٥ وانظر، صحيح الترمذي ١٥٦/٣ .

## ٩٦- دوعای سەفەرو گەشت کردن

٢٠٧- الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ ﴿سُبْحَنَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ(١٣) وَإِنَّآ إِلى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ (١٤)﴾ (الزخرف) (اللهمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذاَ الْبِرَّ والتَّقْوَى، وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى، اللهمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِة، والخَلِيفة فِي الأَهْلِ إِنِّي أعُوذُ بكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ، وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ فِي الْمَالِ والأَهْلِ))، وإِذَا رَجَعَ قَالَهُنَّ وَزَادَ فِيهِنَّ : آيِبُونَ، تَائِبُونَ، عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ﴾[١].

**واتە : خوا گەورەترە، خوا گەورەترە، خوا گەورەترە، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەمەی بۆ ڕام و ژێرِ دەستە کردووین، ئێمە تواناو دەسەلاتمان بەسەریدا نەبوو، ئێمە لە ڕۆژی دوایی بەرەو لای خوای خۆمان دەگەڕێینەوە، خوایە ئێمە لەو گەشتەماندا داوای خێرو چاکەو تەقواو لەخۆ**

(١) مسلم ٢/٩٩٨ .

ترسانت لێدەکەین، داوای کارێکت لێ دەکەین خۆت پێی ڕازیت، خوایە ئەم سەفەرەمان لەسەر سووك و ئاسان بکەی، دووریمان بۆ کورت بکەیتەوە، خوایە تۆ تاکە هاوڕێ و خاوەنی لەم سەفەرەدا، تاکە جێنشینی نێو ماڵ و خێزانمی بۆ ئەوەی ئاگات لێیان بێ، خوایە بە تۆ خۆم لەتاڵی و ناسۆریەکان و ڕووداو و دیمەنە سەیرو دڵتەزێنەکان دەپارێزم، وە بەتۆ خۆم لەوە دەپارێزم کە بەخراپەو ناخۆشی بگەڕێمەوە ناو ماڵ و خێزان و ڕۆڵەکانم، بەجۆرێ کە کارێکی خراپ و شایستەیان کردبێت، کاتێکیش کە پێغەمبەر ﷺ لەسەفەر دەگەڕایەوە ماڵەوە، هەروای دەگورت و ئەوەشی زیاد دەکردو دەیگووت (خوایە وا لە گەشتەکەمان بەتەوبەو پەشیمانی و خواپەرستی و بەندایەتی و سوپاسگوزاریەوە بۆ پەروەردگارمان گەڕاینەوە) .

## ٩٧- دوعای چوونه ناو گوندو شارو ئاواییه‌ك

٢٠٨- اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمواتِ السَّبْعِ وَمَا أَظْلَلْنَ، وَرَبَّ الأَرَضِينَ السَّبْعِ وَمَا أَقْلَلْنَ، وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ، وَمَا أَضْلَلْنَ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَمَا ذَرَيْنَ أَسأَلُكَ خَيْرَ هَذِهِ الْقَرْيَةِ وَخَيْرَ أَهْلِهَا، وَخَيْرَ مَا فِيهَا، وَأَعُوذُبِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ أَهْلِهَا، وَشَرِّ مَا فِيهَا [١] .

**واته : ئه‌ی خوای په‌روه‌ردگاری حه‌وت ئاسمانه‌كان و ئه‌وه‌ی سێبه‌ریان لێ ده‌كاو رایان ده‌گرێو به‌رێوه‌یان ده‌بات، ئه‌ی په‌روه‌ردگاری حه‌وت چینه‌كانی زه‌وی و ئه‌وه‌ی كه هه‌ڵیگرتووه‌و سواری سه‌ریه‌كی كردوون، ئه‌ی په‌روه‌ردگاری شه‌یتانه‌كان و ئه‌وه‌ی كه گومڕایان ده‌كه‌ن، په‌روه‌ردگاری بایه‌كان و ئه‌وه‌ی كه هه‌ڵیان ده‌كه‌ن و ئه‌وه‌ی كه پێیانه، داوای خێرو چاكه‌ی ئه‌و گونده‌و چاكترینی خه‌ڵكی ئه‌و**

(١) الحاكم وصححه ووافقه الذهبي ٢/ ١٠٠ وابن السني برقم ٥٢٤ وحسنه الحافظ في تخريج الأذكار ٥/ ١٥٤ قال ابن باز : ورواه النسائي بإسناد حسن انظر، تحفة الأخبار ص ٣٧ .

گوندەو ئەوەی کە تیایەتی لیَ دەکەم، وە خۆم دەپـارێزم بـەتۆ لەزەرەرو زیانی ئەو گوندەو خەڵکەکەی و ئەوەی کە تیایەتی.

## ٩٨- دوعـای چوونە نێو بـازاڕ

٢٠٩- ﴿لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَـهُ الْمُلْـكُ وَلَـهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُـوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾[1] . لەپێشتر راڤەکراوە

## ٩٩- دوعـای کاتێ کە هۆکاری سواربوون جەنە دەیگرێ

٢١٠- ﴿ بِسْمِ اللهِ ﴾[2] .

سوننەتە ئینسان ئەو کاتە بڵێ : بەناوی خوا.

---

(١) الترمذي ٥/٢٩١ والحاكم ٥٣٨/١ وحسنه الألباني في صحيح ابن ماجه ٢١/٢ وفي صحيح الترمذي ١٥٢/٣ .

(٢) أبو داود ٢٩٦/٤ وصححه الألباني في صحيح أبي داود ٩٤١/٣ .

## ١٠٠- دوعای گەشتیار بۆ ئەو کەسەی لەماڵ و ولاتە

٢١١- ﴿أَسْتَودِعُكُمُ اللهَ الَّذي لاَ تَضِيعُ وَدَائِعُهُ﴾ [١] .

**واتـــه** : بـــه خواتـــان دەســـپێرم كـــه هـــەرگيز ســـپاردەو ئەمانەتەكانی ون ناكات .

## ١٠١- دوعای ئەو كەسەی لە ماڵەوەیە بۆ ئەوەی سەفەر دەكات

١/٢١٢- ﴿أَسْتَودِعُ اللهَ دِينَكَ، وَأَمَانَتَكَ، وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ﴾[٢].

**واته** : ئاين و ئەمانەت و دوا كردەوەكانت بەخوای گەورە دەسپێرم .

٢/٢١٣- ﴿زَوَّدَكَ اللهُ التَّقْوَى، وَغَفَرَ ذَنْبَكَ، وَيَسَّرَ لَكَ الْخَيْـــرَ حَيْثُ مَا كُنْتَ﴾[٣] .

---

(١) أحمد ٤٠٣/٢ وابن ماجه ٩٤٣/٢، وانظر، صحيح ابن ماجه ١٣٣/٢ .

(٢) أحمد ٧/٢ والترمذي ٤٩٩/٥، وانظر، صحيح الترمذي ١٥٥/٢.

(٣) الترمذي وانظر، صحيح الترمذي ١٥٥/٣ .

**واتــه** : خــوای گــەورە تــەقوات زیــاد بکــار لــە گونــاھ و تاوانەکانت خۆش بێ، خێرو چاکەت بۆ ئاسان بکات لەهــەر کوێیەك بیت.

## ١٠٢- تەکبیرو تەسبیح کردن لە ڕەوتی ڕێگاو سەفەردا

٢١٤- قال جابر (ﷺ) ﴿كُنَّا إِذَا صَعَدْنَا كَبَّرْنَـــا، وَإِذَا نَزَلْنَـــا سَبَّحْنَا﴾ [1] .

**واتە** : جــابر هــاوەڵی شــکۆدار ﷺ دەڵــێ : ئێمــە لەگــەڵ پێغەمبــەر ﷺ کــاتێ ســەر دەکــەوتین و بــەرەو بــەرزایی دەچووین، دەمانگوت (الله أكبر)، ره کاتێ کــە دادەبــەزین و بەرەو خوارەوە دەچووین دەمانگوت (سبحان الله) .

## ١٠٣- دوعای گەشتیار ئەگەر پارشێوی بەسەردا هات

٢١٥- سَمَّعَ سَامِعٌ بِحَمْدِ اللهِ، وَحُسْنِ بَلائِـــهِ عَلَيْنَـــا، رَبَّنَـــا

---

(١) البخاري مع الفتح ١٣٥/٦ .

صَاحِبْنَا، وَأَفْضِلْ عَلَيْنَا عَائِذاً بِاللهِ مِنَ النَّارِ [١] .

**واته** : شایەت و گوێگرێك گوێی لەوە بوو كە سوپاس و ستایشمان لەسەر ئەو نازو نیعمەت و تاقی كردنەوانەبوو كە خوای گەورە لەگەڵ ئێمەدا كردی، ئەی پەروەردگارمان هاوڕێیەتیمان بكەو نازو نیعمەت و بەخششی خۆتمان بەسەردا برێژە، بەهۆی ئەوەی كە بەتۆ خۆمان لە ئاوری دۆزەخ دەپارێزین .

## ١٠٤- دوعای گەشتیار كاتێ لە گەشتەكەی یا لەوەختی تر دادەبەزێتە جێگایەك بۆ پاڵكەوتن و حەسانەوە

٢١٦- أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ [٢] .

**واته** : خوایە بەوتە پاك و پیرۆزو تێرو تەواوەكانت خۆم لەزەرەرو زیانی هەموو ئەوە دەپارێزم كە دروستت كردووە .

---

(١) مسلم ٢٠٨٦/٤.

(٢) مسلم ٢٠٨٠/٤.

## ١٠٥- زیكری گەڕانەوە لەسەفەر

٢١٧- يُكَبِّرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ ثَلاثَ تَكْبِيراتٍ ثُمَّ يَقُولُ : لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ، تَائِبُونَ، عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللهُ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ [1].

**واته** : سوننەتە كاتیّ كە ئینسان بەرەو ماڵ و ئاوایی گەڕایەوە لەسەر هەر بەرزاییەك سیّ تەكبیر (الله أكبر) لیّ بداو، پاشان بڵیّ : هیچ خوایەكی بەهەق نیە جگە لە (الله) كە تاك و تەنیاو بیّ شەریكە، سوپاس و ستایش و موڵك و دەسەڵات هەر بۆخوایە، ئەو خوایەی كە لەسەر هەموو شتێك توانادارو بەدەسەڵاتە، بەتەوبەو پەشیمانی و بەندایەتی و سوپاسگوزاریەوە بۆ خوا لەگەشتەكەمان گەڕاینەوە، خوا وەعدی خۆی هێنایە جیّ و، بەندەی خۆی سەرخست و، بەتەنیا لایەن و پارتەكانی تێك شكاندن .

---

(١)پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك كە لەغەزایەك یاخود لەسەفەری حەج گەڕابایەوە ئەوهای دەفەرموو البخاري ١٦٣/٧ ومسلم ٩٨٠/٢ .

## ١٠٦- ئینسان چی دەڵێ لەکاتی هاتنی شتێکی خۆش یا ناخۆش

٢١٨- كَانَ إِذَا أَتاهُ الأَمْرُ يَسُرُّهُ قَالَ : ﴿الْحَمْدُ للهِ الَّذي بنِعْمَتِه تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ﴾ وإِذَا أَتاهُ الأَمْرُ يَكْرَهُهُ قَالَ : (الْحَمْدُ للهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ) ﴾ [1] .

**پێغەمبەر ﷺ ئەگەر شتێکی دڵخۆشکەری بۆ هاتبایە، دەیگوت : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایە بەرزو بەڕێزەی کە بەنازو نیعمەتی ئەو هەموو شتە چاك و پاکەکان تەواو دەبێت، ئەگەر کارێکی بۆ هاتبایە کە دڵتەنگ و نیگەرانی بکردبایە، دەیفەرموو : سوپاس و ستایش بۆ خوای کردگار لە هەموو کات و سات و لەسەر هەموو حاڵ و بارێکدا .**

---

(١) أخرجه ابن السني في عمل اليوم والليلة والحاكم وصححه ٤٩٩/١ وصححه الألباني في صحيح الألباني في صحيح الجامع ٢٠١/٤ .

## ١٠٧- خێرو پلەو پایەی سەلاوەت لێدان لەسەر پێغەمبەرﷺ

پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەخێرو پلەو پایەی صەلاوەت لێدان لەسەر خۆی دەفەرمووێ:

١/٢١٩- قَالَ ﷺ (مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً صَلَّى عَلَيْهِ بِهَا عَشْراً)(١) .

**واتە** : هەر کەسێ تەنها یەك صەلاوەت لەسەر من لێبدا، خوای گەورە لەبری ئەوە (١٠) صەلاوەت لەسەر ئەو لێ دەدات .

٢/٢٢٠- وَقَالَ ﷺ : (لاَ تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيداً وَصَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُ كُنْتُمْ) (٢) .

**واتە** : لەدوای مردنم گۆڕی من مەکەنە شوێنی ئاهەنگ و

---

(١) أخرجه مسلم ٢٨٨/١ .

(٢) أبو داود ٢١٨/٢ وأحمد ٣٦٧/٢ وصححه الألباني في صحيح أبي داود ٣٨٣/٢.

سەناو سەیران و ماتەمینی، بەڵکو زۆر صەلاوەت لەسەر من لێبدەن، چونکە لەهەر کوێیەك بن بێگومان سەلاوەتەکانتان پێم دەگات .

٣/٢٢١- وَقَالَ ﷺ (البَخيلُ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ)(١) .

**واتە** : بەخیل و ڕژد ئەو کەسەیە کە ناوی منی لەلا دێ کەچی سەلاوەتم لەسەر لێ نادات .

٤/٢٢٢- وَقَالَ ﷺ ﴿إنَّ لله ملائكةً سَيَّاحِينَ فِي الأَرْضِ يُبَلِّغُونِي مِنْ أُمَّتِي السَّلاَمَ﴾ (٢) .

**واتە** : خوا چەندان فریشتەی گەڕۆکی لە زەویدا هەن، دەگەڕێن و دەسوڕێن سەلامی ئۆممەتەکەم پێ ڕادەگەیەنن.

٥/٢٢٣- وَقَالَ ﷺ ﴿مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إلاَّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ

---

(١) الترمذي ٥/٥٥١ وغيره وانظر، صحيح الجامع ٣/٥٢ وصحيح الترمذي ٣/١٧٧.

(٢) النسائي والحاكم ٢/٤٢١، وصححه الألباني في صحيح النسائي ١/٢٧٤ .

رُوحِيَ حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلامَ﴾ [1] .

**<u>واته</u> : هەر كەسێ سەلامم لێ بكا ئیللا خوای گەورە رۆح بۆ گیانم دەگێڕێتەوە تا وەڵامی سەلامی بدەمەوە .**

## ١٠٨- سەلام بڵاوكردنەوەو سەلام لەیەكتر كردن

١/٢٢٤- قَالَ رَسُـولُ اللهِ ﷺ : ﴿لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّــةَ حَتَّــى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَو لاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى شَــيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ، أَفشُو السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ﴾ [2] .

**<u>واته</u> : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ئاگاداربن ئێوە ناچـنە بەهەشت تـا بـڕوا بـەخواو پێغەمبەرەكـەی نێـنن، وە بـڕوا ناهێنن و ئیمانتان تەواو نابێ تا یەكترتان خۆش نەوێ، ئایـا شتێكتان پیشان بدەم ئەگەر بیكەن یـەكترتان خـۆش بـوێ، سـڵاو لەیـەكتری بكـەن و سـەلام لـەناو خۆتانـدا زۆر بـڵاو**

---

(١) أبو داود برقم ٢٠٤١ وحسنه الألباني في صحيح أبي داود ١/ ٣٨٣ .

(٢) مسلم ١/٧٤ وغيره .

بکەنەوە .

٢/٢٢٥- ﴿ثَلاثٌ مَنْ جَمَعَهُنَّ فَقَدْ جَمَعَ الإِيمَانَ : الإِنْصَافُ مِنْ نَفْسِكَ، وَبَذْلُ السَّلاَمِ لِلْعَالَمِ، وَالإِنْفَاقُ مِنَ الإِقْتَارِ﴾ [١] .

**واتە : سێ شت هەن هەرکەسێ ئەو سێ شتانەی لەخۆدا کۆبکاتەوە لەخۆدا بێنێتەدی، ئەوا ئیمانی کۆکردۆتەوەو ئیمانی تەواوە، دادپەروەری و بەریژدانی لە بڕیاردان لەخۆتدا، سەلام کردن لەخەڵك و سەلام بەخشین، خێر کردن و بەخشینی لەکاتی هەژاری و نەداری و کەمدەستیدا .**

٣/٢٢٦- ﴿وَعَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ : أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ أَيُّ الإِسْلامِ خَيْرٌ قَالَ : (تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلاَمَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ) [٢] .

**واتە : لە (عبدالله ی کوڕی ئیمامی عومەر رضي الله عنه) دەگێڕنەوە کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردو گووتی : چ کارو کردەوەو ئیسلامەتیەك خێری زۆرترە کە بیکەین،**

---

(١) البخاري مع الفتح ١/٨٢ عن عمار موقوفاً معلقاً .

(٢) البخاري مع الفتح ١/٥٥ ومسلم ١/٦٥ .

ئەویش فەرمووی : خواردن ببەخشەو بەخەلکی بدە، سەلام لەو کەسە بکە کە دەیناسی و نایناسیت .

## ١٠٩- چۆن وەلامی سەلامی بێ باوەڕ دەدەیتەوە

٢٢٧- ﴿إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ فَقُولُوا : وَعَلَيْكُمْ﴾ (١) .

**واتە** : ئەگەر ئەهلی کیتابیەك سەلامی لێکردن پێی بڵێن (وعلیکم) لەسەر ئێوەش .

## ١١٠- دوعای کاتی کەلەشێر خوێندن و زەڕینی گوێدرێژ

٢٢٨- ﴿إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيكَةِ فَاسْأَلُوا اللهَ مِنْ فَضْلِهِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكاً وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهُ رَأَى شَيْطَاناً﴾ (٢) .

---

(١) البخاري مع الفتح ٦/٣٥٠ ومسلم ٤/٢٠٩٢ .

(٢) البخاري مع الفتح ١١/٤٢، ومسلم ٤/١٧٠٥ .

**واتە** : ئەگەر گوێتان لەدەنگی کەڵەشێر بوو، داوای چاکەو بەخشش لە خوای گەورە بکەن چونکە ئەو فریشتەیەکی بینیوە، ئەگەر گوێتان لە زەڕینی کەر بوو، خۆتان بەخوای گەورە لە شەیتانی نەفرەت لێکراو بپارێزن و (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) بڵێن، چونکە ئەوا شەیتانی بینیوە بۆیە زەڕیوە .

## ١١١- دوعای کاتی وەڕینی سەگ بەشەو

٢٢٩- ﴿إِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الكِلاَبِ وَنَهِيقَ الْحَمِيرِ بِاللَّيْلِ فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنْهُنَّ فَإِنَّهُنَّ يَرَيْنَ مَا لاَ تَرَوْنَ﴾ [١] .

**واتە** : ئەگەر بەشەو گوێتان لە وەڕینی سەگ و لە زەڕینی کەر بوو، ئەوا بەخوای گەورە خۆتان لێیان بپارێزن، چونکە ئەمانە شتێك دەبینن کە ئێوە نابینن، بۆیە ئاوا دەکەن .

---

(١) أبو داود ٣٢٧/٤ وأحمد ٣٠٦/٣ وصححه الألباني في صحيح أبي داود ٩٦١/٣ .

## ١١٢- دوعا كردن بۆ ئەو كەسەی كە جنێوت پێداوە

٢٣٠- قال ﷺ : ﴿اللَّهُمَّ فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ سَبَبْتُهُ فَاجْعَلْ ذلِكَ لَــهُ قُرْبَةً إِلَيْكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ [١] .

واتە : خوایە ئەگەر جنێوم بەهەر ئیمانــدارێك داوە، ئــەوەی بۆ بكە مایەی نزیك بوونەوە لەخۆت لە ڕۆژی دواییدا .

## ١١٣- ئینسانی موسڵمان چی دەڵێ ئەگەر مەدحی موسڵمانێك كرا

٢٣١- قَالَ ﷺ (إِذَاكَانَ أَحَدُكُمْ مَادحاً صَاحِبَهُ لاَ مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ : أَحْسبُ فُلاَناً والله حَسِيبُهُ وَلاَ أُزَكِّي عَلَى اللهِ أَحَداً أَحْسبُهُ – إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذَاكَ- كَذَا وَكَذَا)[٢] .

واتە : ئەگەر یەكێك لە ئێوە مــەدحی هاوڕێكــەی دەكــرد ، دەبێ بڵێی : وابزانم كە فلانەكەس ئاواو ئاوایە، ئەگــەر ئــەو

---

(١) البخـاري مـع الفـتح ١٧١/١١ ومــسلم ٢٠٠٧/٤ بەگێرانــەوەی موســلیم (بیكە زەكاتو بەزدیی).

(٢) رواه مسلم ٢٢٩٦/٤.

سیفەتەکەی بوو کەباس دەکرار سیفەتەکەی لێ دەزانی باسی دەکا، هەرچەند خوای گەورە لە هەموو کەس باشتر دەیناسێ، کەسیش بەسەر خوای گەورەدا بەپاك ڕاناگرم، بەڵام ئەوەی من شارەزای بم ئاوایە، یانی دان بە مەدح و سیفەتە چاکەکانی دادێنێت .

## ١١٤- ئینسانی موسڵمان چی دەڵێ ئەگەر مەدح و تەزکیەی کرا

٢٣٢- ﴿اللهمَّ لا تُؤَاخذْني بمَا يَقُولونَ، وَاغْفِرْ لِي مَا لاَ يَعْلَمونَ (وَاجْعَلْني خَيْراً ممَّا يَظُنُّون) ﴾[1] .

واتە : خوایە ئەوەی کە دەربارەی من دەیلێن بە گوناه و زۆر لەسەرم مەگرەو، لەو گوناه و تاوانانەم خۆش بە کە ئەوان

(١) البخاري في الأدب المفرد برقم ٧٦١، وصحح إسناده الألباني في صحيح الأدب المفرد برقم ٥٨٥، وما بين المعكوفين زيادة للبيهقي في شعب الإيمان ٢٢٨/٤ من طريق آخر.

نایزانن بۆیه بەچاکه باسم دەکەن، خوایـه لـەوەم زۆر باشـترو چاکتر بکه که ئەوان گومانم پێ دەبەن و پێم وەسف دەکەن .

## ١١٥- ئەوەی لەناو جلی ئیحرامە چۆن لەکاتی حەج و عومرە تەلبیە دەکات

٢٣٣- ﴿لَبَّيْكَ اللهمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَـكَ لَبَّيْـكَ، إنَّ الْحَمْدَ، وَالنِّعْمَةَ، لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ﴾ [1] .

**واتە** : خوایه وا وەلامم دایتەوەو بە پەیل بانگەوازەکەت هـاتم و لـە خزمـەتتم، هـیچ شـەریك و هاوبەشـێکت نیـە و لـە خزمەتتم، بەڕاستی هەرچی سوپاس و ستایش، نازو نیعمەت و بەخشش و، موڵك و ماڵ و دەسەڵات هەیه بۆ تۆیه، خوایه هیچ شەریك و هاوەڵێکت نیه .

---

(١) البخاري مع الفتح ٤٠٨/٣ ومسلم ٨٤١/٢ .

## ١١٦- تەكبیر كردن كاتی گەیشتنە گۆشەی بەردە ڕەشەكە لە كەعبەدا.

٢٣٤- ﴿طَافَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْبَيْتِ عَلَى بَعِيرٍ كُلَّمَا أَتَى الـــرُّكْنَ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ عِنْدَهُ وَكَبَّرَ﴾ [(١)] .

**واتــه :** پێغەمبــەری خــوا ﷺ لەســەر ســواری حوشــترەوە بەدەوری كابەدا دەخولایەوە، هەركاتێ كە دەگەیشتە ڕاستی گۆشەی بەردە ڕەشەكە، بە شتێك كەلەلای بوو ئامــاژەی بــۆ لای دەكردو الله أكبری گوت .

## ١١٧- دوعا كردن لە نێوان گۆشەی بەردە ڕەشەكەو گۆشەی لای یەمەن

٢٣٥- ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي

(١) البخاري مع الفتح ٤٧٦/٣ مەبەست لەو شتە (گۆچان)ە انظر: البخاري مع الفتح ٤٧٢/٣ .

ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ ﴾(سورة البقرة)[1] .

**واته** : خوایە لەدونیاو دوارۆژدا چاکەمان پێ ببەخشەو چاکەمان لەگەڵدا بکە، لەسزاو ئازاری دۆزەخمان بپارێزە .

## ١١٨- دوعای کاتی وەستان لەسەر تەپۆڵکەی سەفاو مەڕوادا.

٢٣٦- ﴿لَمَّا دَنَا ﷺمِنَ الصَّفَا قَرَأَ (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَائِرِ اللهِ) أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللهُ بِهِ] فَبَدَأَ بِالصَّفَا فَرَقِيَ عَلَيْهِ حَتَّى رَأَى الْبَيْتَ فَا سْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَوَحَّدَ اللهَ وَكَبَّرَهُ وَقَالَ : ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ، ثُمَّ دَعَا بَيْنَ ذلِكَ قَالَ مِثْلَ هذا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ)) الْحَدِيثُ، وَفِيهِ (فَفَعَلَ عَلَى الْمَرْوَةِ كَمَا فَعَلَ عَلَى

(١) أبو داود ١٧٩/٢ وأحمد ٤١١/٣ والبغوي في شرح السنة ١٢٨/٧، وحسنه الألباني في صحيح أبي داود ٣٥٤/١ . والآية من سورة البقرة، ٢٠١ .

الصَّفَا) [1] .

**واته** : كاتێ كە پێغەمبەر ﷺ لە دواى تەوا فكردنى لە تەپۆلكەى سەفا نزيك بوويەوە، ئەم ئايەتەى خوێندەوە كە خواى گەورە دەفەرمووێ: (ان الصفا والمروه من شعائرالله...) واتە بەڕاستى صەفاو مەڕوا يەكێكن لە دروشمەكانى خواى گەورە، بۆيە بەوە دەست پێ دەكەم كە خوا لە ئايەتەكە دەستى پێ كردووە،

**واته** : لە سەفا دەست پێدەكەم، بۆيە هاتوچۆكەى لە سەفا دەست پێكردو چووەسەر تەپۆلكەى سەفا تا بەيتى بينى و بەيتى لێ دەركەوت، ئەوسا ڕوى كردە ڕوگەو، خواى بەتاك و تەنيا گرت و تەكبيرى كردو، گوتى : هيچ خوايەك نيە جگە لەو خوايەى كە (الله)يەو بێ شەريك و هاوەڵە، هەرچى سوپاس و موڵك و دەسەڵاتە،بۆ خوايە، ئەو خوايە بەسەر هەموو شتێكدا زاڵ و تواناداره، هيچ خوايەكى بەهەق نيە

---

(١) مسلم ٢/٨٨٨.

جگە لە خوای تاك و تەنیا نەبێ، ئەو خوایەی کە بەڵێنی خۆی بەدی هێنا، بەندەی خۆی سەرخست و بەتەنیا حزبەکانی تێکشکاندن، پاشان لە نێوان ئەوەدا دوعای دەکردو سێ جار ئەوەی دەگوتەوە، وە فەرموودەکە ئەوەشی تیایە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر تەپۆلکەی مەروەش وەکو هی سەر سەفای دەکردو دەگوت .

## ١١٩- دوعای ڕۆژی عەرەفە لەکاتی حەجدا

٢٣٧- ﴿خَيْرُ الدُّعَاءُ دعاء يَوْمِ عَرَفَةَ، وَخَيْرُ مَاقُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي : لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[1].

**واتە** : باشترین دوعا دوعای ڕۆژی وەستان و مانەوەیە لە عەرەفە، وە باشترین شت کەمن و پێغەمبەرانی پێش من

(١) الترمذي وحسنه الألباني في صحيح الترمذي ١٨٤/٣، وفي الأحاديث الصحيحة ٦/٤.

وتويانه، ئەوە بووە كە گوتويانە : هيچ خوايەك نيە جگە لە (الله) نەبێ كە تاك و تەنياو بێ شەريكەو، سوپاس و ستايش و مولك و دەسەلات بۆ ئەوە، وە ئەو خوايە بەسەر هەموو شتێكدا تواناداررو بەهێزو دەسەلاتە .

## ١٢٠- زيكرو دوعاى شوێنى (المشعر الحرام) لەموزدەليفە

٢٣٨- ﴿رَكِبَ ﷺ الْقَصْوَاءَ حَتَّى أَتَى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ فاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ (فَدَعَاهُ، وَكَبَّرَهُ، وَهَلَّلَهُ، وَوَحَّدَهُ) فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفاً حَتَّى أَسْفَرَ جِدّاً فَدَفَعَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ﴾ [١] .

واتە : پێغەمبەر ﷺ سوارى حوشترەكەى بوو كەناوى (قصواء) بوو، تا گەيشتە ناوچەى مشعر الحرام كەلە مەزدەليفەيە، دواى ئەوەى ناوچەى عەرەفەى جێ هێشت، لەوێ لە مشعر الحرام ڕووى كردە ڕووگەو الله أكبرى دەكرد، لا اله الا الله ى دەگوت و لە خواى گەورە دەپاڕايەوەو دوعاى

---

(١) مسلم ٨٩١/٢ .

دەکرد ، خوای گەورەی بەتاك و پاکدەگرت، بەردەوام ئـاوا بـە پێوە مایەوە تا دونیا ڕوناك بوو، پـێش خـۆر هـەڵبێ لـەوێ دەرچوو بەرەو شوێنی شەیتان ڕەجم کردن ڕۆیشت.

## ١٢١- تەكبیر كردن كاتی ڕەجم كردنی شەیتانەكان لەگەڵ هەموو دەنكە بەردێكدا

٢٣٩- ﴿يُكَبِّرُ كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ عِنْدَ الْجِمَارِ الثَّلاَثِ ثُمَّ يَتَقَدَّمُ، وَيَقِفُ، وَيَقِفُ يَدْعُو مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، رَافِعاً يَدَيْهِ بَعْدَ الْجَمْـرَةِ الأولى والثَّانِيَةِ، أمَّا جَمْرَةُ الْعَقَبَةِ فَيَرْمِيهَا وَيُكَبِّرُ عِنْدَ كُلِّ حَصَاةٍ وَيَنْصَرِفُ وَلاَ يَقِفُ عِنْدَهَا﴾ [(١)] .

**واتە** : پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێ بـە بـەرد ڕەجمـی هەرسـێ شەیتانەکانی دەکرد ، دەیگوت الله أکبر، پاشان بەرەو پێشەوە دەچوو، بەپێوە دەوەستاو بەرەو ڕووگە دوعای لـەخوای گـەورە

(١) البخاري مع الفتح ٥٨٣/٣ و ٥٨٤/٣ وانظر، لفظه هنالك و البخاري مع الفتح ٥٨١/٣ ورواه مسلم أيضاً .

دەكـــرد ، لـــە دوای ڕەجمكردنـــی شـــەیتانی یەكـــەم و دووەم دەستەكانی بەرز دەكردەوە، بـەلاّم لـەكاتی شـەیتانی گـەورە (جمرة العقبة) لەكاتی هاویشتنی هـەر بـەردێك الله أكـبری دەكردو پاشان خۆی وەردەسوڕاندەوەو لەلای نەدەوەستا .

## ١٢٢- دوعای سەرسام بوون و دیتنی شتی سەیرو دڵگیرو سەرنج ڕاكێش

٢٤٠/١- ﴿سُبْحَانَ اللهِ!﴾ [1] .

**واتە** : پاكی و بێگەردی بۆ خوا .

٢٤١/٢- ﴿اللهُ أَكْبَرُ﴾ [2] .

**واتە** : خوا گەورەترە.

---

(١) البخاري مع الفتح ٢١٠/١ و ٣٩٠ و ٤١٤ ومسلم ١٨٥٧/٤ .

(٢) البخاري مع الفتح ٤٤١/٨ وانظر، صحيح الترمذي ١٠٣/٢ و ٢٣٥/٢ ومسند أحمد ٥،٢١٨ .

## ١٢٣- ئینسان چی دەكات كاتێ هەواڵ و شتێكی خۆشی بۆ هات

٢٤٢- ﴿كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَتَاهُ أَمْرٌ يَسُرُّهُ أَوْ يُسَرُّ بِـهِ خَـرَّ سَاجِداً شُكْراً لِلهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى﴾ [1] .

**واتە : ئەگەر هەواڵێكی دڵخۆشكەریان بـۆ پێغەمبـەر ﷺ هێنا با، دڵی پێخۆشبایە، یەكسەر دەكەوتە سەجدەو سوپاس و ستایش خوای باڵا دەستی دەكرد .**

## ١٢٤- كاتێ ئینسان لەلاشەی خۆی هەست بە ئێش و ئازار دەكا چی دەكاو چی دەڵێ؛

٢٤٣- ﴿ضَعْ يَدَكَ عَلَى الَّذِي تَأَلَّمَ مِنْ جَسَدِكَ وَقُلْ : بِسْمِ اللهِ، ثَلاثاً، وَقُلْ سَبْعَ مَرَّاتٍ، أَعُوذُ بِاللهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَـا أَجِـدُ

---

(١) رواه أهل السنن إلا النسائي، انظر، صحيح ابن ماجه ١/٢٣٣ وإرواء الغليل ٢/٢٢٦ .

وَأُحَاذِرُ﴾ (١).

**واتە** : دەستت لەسەر ئەو شوێنە دابنێ کە لەلاشەت ئێش و ژان و دەکا، سێ جار بڵێ : بەناوی خوای گەورە حەوت جار بڵێ : بەخوای کردگارو هێزو دەسەڵاتەکەی، خۆم دەپارێزم لەزەرەرو زیان و خراپەی ئەوەی کە هەمەو و لەوەی کە ڕووم تێ دەکاو لێی دەترسم .

## ١٢٥- دوعای کەسێك کە لەچاو پیسی دەترسێ

٢٤٤- ﴿إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مِنْ أَخِيهِ، أَوْ مِنْ نَفْسِهِ، أَوْ مِنْ مَالِهِ مَا يُعْجِبُهُ (فَلْيَدْعُ لَهُ بِالْبَرَكَةِ) فَإِنَّ الْعَيْنَ حَقٌّ﴾ (٢).

**واتە** : ئەگەر یەکێك لە ئێوە شتێکی دڵگرو سەرنج ڕاکێشەری لە برایەکەی یا لەخۆی یا لە سەروەت و سامانی خۆی دیت کە پێی سەرسام بوو، بادوعای خێرو بەرەکەتی بۆ

---

(١) مسلم ٤/١٧٢٨ .

(٢) مسند أحمد ٤/٤٤٧ وابن ماجه، ومالك، وصححه الألباني في صحيح الجامع ١/٢١٢ وانظر، تحقيق زاد المعاد للأرناؤوط ٤/١٧٠ .

بكـا، چـونكه چارپيـسى و چـاو ليّـدان هه‌يـه‌و ڕاسـت و كاريگه‌ره.

## ١٢٦- له‌كاتى ترساندا ده‌ڵێ

٢٤٥- ﴿ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ ! ﴾ [(١)] .

واته : هيچ خوايه‌ك نيه جگه لـه‌خوا (اللّه)ى تـاك و تـه‌نيا نه‌بێ .

## ١٢٧- له‌كاتى سه‌ربڕين و قوربانيدا ده‌ڵێ

٢٤٦- ﴿ بِسْمِ اللهِ واللهُ أَكْبَرُ (اللهمَّ مِنْكَ وَلَكَ) اللَّهُمَّ تَقَبَّـلْ مِنِّي﴾ [(٢)] .

واته : به‌ناوى خوا، خوا گه‌وره‌تره، خوايه ئه‌وه له‌تۆوه‌يه‌و بـۆ تۆيه، خوايه ئه‌م قوربانيه‌م لێ قه‌بوول بكه .

---

(١) البخاري مع الفتح ٦/١٨١ ومـسلم ٤/٢٢٠٨ .

(٢) البخاري مع الفتح ١١/١٠١ .

## ١٢٨- ئەوەی کە بۆ ڕەد دانەوەی فڕو فێڵە بێ سوودەکانی شەیتانەکان دەگوترێ

٢٤٧- (أعُوذُ بِكَلمات الله التَّامَّات الَّتِي لاَ يُجَاوِزُهُنَّ بَـرٌّ وَلاَ فاجرٌ مِنْ شَرِّما خَلَق وَبَرأَ وَذَرَأَ، وَمِنْ شَرِّ ما يَنْزِلُ مِنَ السَّماء وَمِنْ شَرِّ ما يَعْرُجُ فِيها وَمِنْ شَرِّ ماذَرَأَ فِي الأَرْضِ، ومِنْ شَرِّ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا، وَمِنْ شَرِّ فِتَنِ اللَّيْلِ والنَّهارِ، وَمِنْ شَرِّ كُلِّ طَـارِقٍ إلاَ طارِقاً يَطْرُقُ بِخَيْرٍ يَا رَحْمَنُ)[١]

**واتە : خۆم بەو وتە تێرو تەواو و پیرۆزانەی خوا دەپارێزم لەو زەرەرو زیان و خراپەیەی کە دروستی کردووەو لەسەر کەس باز نادا، ئینسانی چاك و خراپ قوتار ناکا، ئەو خوایەی کە خەڵك دروست دەکاو، قوتار دەکا، وە خۆم لە زەرەرو زیانەکانی ئەوە دەپارێزم کە لەئاسمانەوە دێتە خوارەوە، یا تیایدا سەردەکەوێ و دەخولێتەوە، وە لەوەی کە لەزەویدا دروست و بەرهەڤی کردووەو، لەوەی کەتیایەتی و لێی**

(١) أحمد ٤١٩/٣ بإسناد صحيح وابن السني برقم ٦٣٧ وصحح إسناده الأرناؤوط في تخريجه للطحاوية ص١٣٣ وانظر، مجمع الزوائد ١٢٧/١٠ .

**دەردەچێ و دێتە دەرەوە، وە لەزەرەرو زیانی ئاشوب و ئاژاوەو خراپەکانی شەوو ڕۆژو، لەو خراپەیەی کە لە شەودا دێ و دەردەکەوێ، تەنها لەو تاریکیەشەوە نەبێ، کە بەخێرو چاکەی خوا دێ و دەردەکەوێت .**

## ١٢٩- داوای لێخۆشبوون لەخواو تۆبەکردن

**١/ ٢٤٨-** قال رسول الله (ﷺ): (وَاللهِ انِّي لأَسْتَغْفِرُ اللهَ وَاتُوبُ الَيْهِ فِي الْيوْمِ أكْثَرَ منْ سَبعِينَ مرّةً)(١).

**واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ:، سوێند بەخوا من تەنها لە ڕۆژێکدا (٧٠)جار، داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە دەکەم، بەرەو لای خوا تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە.**

**٢ /٢٤٩ -** وَقَالَ ﷺ : ((يَا أَيُّها النَّاسُ تُوبُوا إلى اللهِ فَإنِّي أتُوبُ فِي اليَوْمِ إلَيْهِ مَائَةَ مَرَّةً))(٢) .

**واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ئەی خەڵکینە**

---

(١) البخاري مع الفتح ١١/١٠١.

(٢) مسلم ٤/٢٠٧٦ .

بگەڕێنەوە لای خواو تەوبە بکەن لەگوناهەکانتان، خۆمن بۆ خۆم تەنها لـە ڕۆژێکـدا سـەد جـار داوای لێخۆشـبوونی لێ دەکەم و تەوبە دەکەم.

٣/٢٥٠- وَقَالَ ﷺ: ((مَنْ قَالَ اَستَغفرُ اللهَ الْعَظِيمَ الَّذي لاَ إِلَهَ إلاَّ هُوَ الحَيُّ القَيُّومُ وَأَتوبُ إِلَيْهِ، غَفَرَ اللهُ لَهُ وَإِنْ كَانَ فَرَّ مِـنَ الزَّحْفِ)) .[1]

**<u>واتە</u> : هەرکەسێ بڵێ : ئەی خـوای گـەورە داوای لێبـوردنم هەیەو لە گوناه و تاوانەکانم خۆشـبە، هـیچ خوایـەك نیـە، تەنها ئەو خوایە نەبێ کـە (الله)یـە و، هەمیـشە زینـدووەو ڕاگر و بەڕێوەبەری بوونەوەرەو، تەوبە بەرەو لای ئەو ئەکـەین، خـوای گـەورە لێـی خـۆش دەبـێ ئەگـەر لەجـەنگی دژ بـە کافرانیش هەڵاتبێ**

٤/٢٥١- وَقَـالَ ﷺ: ((أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدِ مِنَ الرَّبُّ فِـي

---

(١) أخرجا أبو داود ٨٥/٢ والترمذي ٥٦٩/٥ والحاكم وصـححه وافقـه الذهبـي ٥١١/١ وصححه الألباني، انظر، صحيح الترمذي ١٨٢/٣ وجامع الأصـول لأحاديث الرسول ﷺ ٣٨٩/٤ – ٣٩٠ بتحقيق الأرناؤوط .

جَوْفَ اللَّيْلِ الآخِرِ فَإِن اسْتَطَعْتَ أَنْ تُكونَ مِمَّنْ يَذْكُرُ اللهَ فِـي تِلْكَ السَّاعَةِ فَكُنْ)) [1] .

**واتە : نزیکترین کـاتی پـەروەردگار لـە بەندەکـەی بریتیـە لەکۆتایی شەو، ئەگەر دەتوانی لەو کاتانـەدا زیکـرو یـادی خواو دوعا بکەی، زۆر بیکەو باشە .**

**٥/٢٥٢- وَقَـالَ ﷺ** : ((أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُـوَ سَاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ)) [2] .

**واتە : نزیکترین کاتی بەندە لەپـەروەردگاری، ئـەو کاتەیـە کەلە سوجدە دایە، بۆیە لەو کاتە زۆر دوعاو پاڕانەوە لـەخوا بکەن بەلکو لێتان خۆش بێت.**

**٦/٢٥٣- وَقَالَ ﷺ** : ((إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي وَإِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللهَ

---

(١) أخرجه الترمذي والنسائي ٢٧٩/١ والحاكم وانظر، صحيح الترمذي ١٨٣/٣ وجامع الأصول بتحقيق الأرناؤوط ١٤٤/٤ .

٢مسلم ٣٥٠/١ .

فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ)) [1] .

**واته** : هەڵەو تارمایی و لەبیرچوون و بێئاگایی دڵم دادەگرێ و دادەپۆشێ، بەڵام لە ڕۆژێکدا سەد جار داوای تەوبەو لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم، بۆ ئەوەی لە هەڵەو بێئاگاییەکانم ببورێت و لەخوا بێ ئاگا نەبم .

## ١٢٠- خێرو پلەو پایەی (تەسبیح و تەحمیدو تەهلیل و تەکبیر) کردن

١/٢٥٤- قَالَ ﷺ مَنْ قَالَ : ((سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ)) [2] .

---

(١) ئیبنولئەسیر دەڵێ: ((لیغان علی قلبی) واتە: دڵم دادەگرێت و دایدەپۆشێت و مەبەستیش لێی: هەڵ و سەهو کردنە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشە لەپتر کردنی زیکرو نزیک بونەوەو چاودێری کردنی بەردەوام دابوو، ئەگەریش لەهەندێك کاتدا هەڵەی لەشتێك لەوانەکردبا، یاخود لەیادی کردبا ئەوا بەگوناهێك لەسەر خۆی دادەنا، بۆیە هەرزوو پەنای بۆ داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە دەبرد أخرجه مسلم ٤/٢٠٧٥

(٢) البخاري ٧/١٦٨ ومسلم ٤/٢٠٧١ وانظر، فضل من قالها مائة مرة إذا أصبح وإذا أمسى ص ٦٥ من هذا الكتاب .

**واته** : هەرکەسێك لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ (سبحان الله وبحمده) پاکی و بێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، ئەگەر بە قەد کەفی سەر دەریا گوناه و تاوانی هەبێت، خوای گەورە ئەو ڕۆژە لە گوناه و تاوانەکان پاکی دەکاتەوەو گوناهەکانی دەسڕێتەوە .

٢/٢٥٥- وَقَالَ ﷺ : ((مَنْ قَالَ لاَ إِلَـهَ إلاَّ اللهُ وَحْـدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَـيْءٍ قَـدِيرٌ عَشْرَ مرات، كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ أَرْبَعَةَ أَنْفُسٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ))

**واته** : هەر کەسێك هەر کاتێك (١٠)جار بڵێ (لا الـه الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير) هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی کە (الله)یە و تاك و تەنیایە، بێ شەریك و هاوەڵەو، هەرچی موڵك و دەسەلات و سوپاس و ستایشە بۆ ئەوە، ئەو خوایە لەسەر هەموو شتێکی ژیان و بوونەوەر توانادارە، بەقەد خێری ئەوەی پێدەگا کە چوار کەسی لە ڕۆڵەکانی حەزرەتی إسماعیل ئازاد کردبێ .

٣/٢٥٦- وَقَالَ ﷺ : ((كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ

فِي الميزَانِ، حبيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمن : سُبحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ))[1] .

**واته** : دوو وشەی زیکر هەن کە لەسەر زارو زمان زۆر سووك و ئاسانن، بەلاّم لەتەرازووی خێرو چاکەو کردەوەکاندا زۆر قورس و گران و بە نرخ و بە بەهان، وە لەلای خوای گەورەش زۆر خۆشەویستن، ئەم دوو وشەیەش بریتین لە (سبحان الله وبحمده سبحان الله العظيم)

**واته:** پاکی و بێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو تاك و تەنیا .

٤/٢٥٧- وَقَالَ ﷺ : ((لأَنْ أَقُولَ سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ))[2] .

**واته** : ئەگەر بڵێم (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله أكبر) بەلامەوە زۆر خۆشترە لەهەر شتێك کە ڕۆژی

(١) البخاري ١٦٨/٧ ومسلم ٢٠٧٢/٤ .

(٢) مسلم ٢٠٧٢/٤ .

لەسەر هەڵدێت، واتە لەهەرچی لە دونیادا هەیە .

٥/٢٥٨- وَقَالَ ﷺ : (( أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ)) فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ ؟ قَالَ : ((يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ، فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ)) [١] .

**واتە : سەعد دەڵێ : ئێمە لەلای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین فەرمووی : ئایا کێ لە ئێوە بێ تاقەت دەبێ هەموو ڕۆژێك هەزار چاکە بۆ خۆی بەدەست بێنێت یەکێك گوتی چۆن هەزار چاکەمان بۆ دەبێت؟، ئەویش فەرمووی، ئەگەر سەد جار سبحان الله بڵێ، هەزار خێرو چاکەی بۆ دەنوسرێ و هەزار گوناە و تاوانیشی لێ هەڵدەوەرێ.**

٦/٢٥٩- ﴿مَنْ قَالَ ﷺ: سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ غُرِسَتْ لَهُ نَخْلَةٌ فِي الْجَنَّةِ﴾[٢] .

**واتە : هەرکەسێك یەك جار بڵێ : (سبحان الله العظیم**

---

(١) مسلم ٢٠٧٣/٤ .

(٢) أخرجه الترمذي ٥١١/٥ والحاكم ٥٠١/١ وصححه ووافقه الذهبي وانظر، صحيح الجامع ٥٣١/٥ وصحيح الترمذي ١٦٠/٣ .

وبحمده).

**واتە:** پاکی و بێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو بەرز، لەبەرانبەردا دار خورمایەکی بۆ لەنێو بەهەشت دەڕوێت .

٧/٢٦٠- وَقَالَ : (يَاعَبْدَ اللهِ بْنَ قَيْسٍ أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ ؟ ) فقلتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ ! قالَ : قُلْ (لاحَوْلَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ)) [1] .

**واتە :** پێغەمبەر ﷺ بە عەبدوللای کوڕی قەیسی هاوەڵی گوت : ئەی عەبدوللا ئایا گەنجینەیەك لە گەنجینەکانی بەهەشتت پیشان بدەم بۆخۆت لێی بەهرەمەند بی، ئەویش گوتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بڵێ (لا حول ولا قوة إلا بالله)

**واتە :** هیچ هێزو توانایەك نیە تەنها بەخوا نەبێت .

٨/٢٦١- وَقَالَ ﷺ ((أَحَبُّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ أَرْبَعٌ : سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَر لاَ يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ

---

(١) البخاري مع الفتح ٢١٣/١١ ومسلم ٢٠٧٦/٤ .

بَدَأْتَ))[1] .

**واتە : خۆشترین وشە بەلای خواوە ئەم چوار وشەیەن ﴿سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أكبر﴾ جا بەهەر کامێك لەم چوارانە دەست پێ بکەی جیاوازی نیە .**

٩/٢٦٢- جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ : عَلِّمْنِي كَلاَماً أَقُولُهُ : قَالَ : ((قُلْ : لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، اللهُ أَكْبَرُ كَبِيراً، وَالْحَمْدُ للهِ كَثِيراً، سُبْحَانَ اللهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لا حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ)) قَالَ فَهَؤُلاَءِ لِرَبِّي فَمَا لِي؟ قَالَ ((قُلْ اللهمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي))[2] .

**واتە : عەرەبێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەرو ﷺ پێی گوت : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیەکم فێر بکە کە هەموو جار بیلێم. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی بلێ : (لاَ إِلَهَ**

---

(١) مسلم ١٦٨٥/٣ .

(٢)ئەبو داود ئەوەی لێ زیادکردووە: کاتێك کابرا دەشتەکی یەکە لەوێ ڕۆیشت، پێغەمبەر (ص) فەرمووی: ( گومانی تێدا نییە دەستەکانی تەژی بوون لەخێرو چاکە). ٢٢٠/١مسلم ٢٠٧٣/٤.

إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، اللهُ أَكْبَرُ كَبِيراً، وَالْحَمْدُ للهِ كَثِيراً، سُبْحَانَ اللهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لا حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ بِـــاللهِ الْعَزِيـــزِ الْحَكِيمِ).

**واته : هیچ خوایەك نیه جگە لە (الله) کـە تـاك و تـەنیاو بێ شەریکە، خوا گەورەی خوای هـەرە گەورانــە، سـوپاس و ستایشی زۆر بۆ خوای گەورە، پـاکی و بێگـەردی بـۆ خـوای پەروەردگاری جیهانیان، هیچ گۆڕان و هێـزو توانایـەك نیـە، تـەنها بـەهۆی خـوای گـەورەو کـار بـەجێ نـەبێ، ئەوسـا دەشتەکیەکەش وتی : ئەوە بۆ خوایەو بۆ خوا دەگوترێ، ئـەی بۆ خۆم چی بڵێم چاکە بەرانبەر خوای گەورە ؟، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : بڵێ : خوایە لێم خۆشبەو ڕەحـم پـێ بکـەو هیدایەتم بدەو رزق و ڕۆزیەکی چاك و فراوانم پێ ببەخشە .**

٢٦٣/١٠- كانَ الرَّجُلُ إذَا أَسْلَمَ عَلَّمَهُ النَّبِيُّ ﷺ الصَّلاَةَ ثُـــمَّ أَمَرَهُ أَنْ يَدْعُوَ بِهَؤُلاءِ الْكَلِمَاتِ : ((اللهمَّ اغفِرْ لِي، وَارْحَمني، وَاهْدِنِي، وَعَافِنِي وَارْزُقْنِي))[1]

(١) لەریوایەتێکی موسلیم دا هـاتووە فـەرمووی : ( بێگومـان ئـەو وشـانە دونیاو ڕۆژی دواییت بەیەکەوە بۆکۆدەکەنەوە).

**واتــه** : طــارقــى ئەشــجەعى دەڵــێ : هــەركاتێ پیاوێــك موسڵمان دەبوو، پێغەمبەر ﷺ سەرەتا فێری نوێژی دەكــرد، پاشان فەرمانى پێدەكرد كە بەم وشانە دوعا بكاو لە خــواى گەورە بپارێتەوە خوایە لێم خۆشبە، خوایە ڕەحــم پــێ بكــە، خوایە هیدایەتم بدە، خوایە ساغ و سەلامەتم بكەو لێم ببورە، خوایە ڕزق و ڕۆزیەكى چاك و حەلاڵم پێ بدە .

٢٦٤/١١- (إِنَّ أَفْضَلَ الدُّعَاءِ الْحَمْدُ للهِ، وَأَفْضَلَ الذِّكْرِ لاَ إِلَهَ إِلا اللهُ) [١] .

**واته** : بێگومان باشترین دوعــا (الحمـدلله)یـەو، باشـترین زیكریش (لا اله الا الله)یە .

٢٦٥/١٢-ئەو شتە خێرو چــاكانەى كــە هەمیــشە دەمێــنن بریتین لەمانە (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَــهَ إلاَّ اللهُ، واللهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ) [٢].

---

(١) الترمـذي ٤٦٢/٥ وابـن ماجـه ١٢٤٩/٢ والحـاكم ٥٠٣/١ وصـححه ووافقـه الذهبـي وانظر، صحيح الجامع ٣٦٢/١ .

(٢) أحمد برقم ٥١٣ بترتيب أحمـد شـاكر وإسـناده صـحيح وانظر، مجمع الزوائـد ٢٩٧/١، وعزاه ابن حجر في بلوغ المرام من روايـة أبـي سـعيد الى النسـائي وقال : صححه ابن حيان والحاكم .

## ١٣١- پێغەمبەر ﷺ چۆن تەسبیحاتی دەکرد

٢٦٦-عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: ((رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَعْقِدُ التَّسْبِيحَ بِيَمِينِهِ))[١].

**واتە** : عەبدوللای کوڕی عەمر رضي الله عنه دەڵێ : پێغەمبەری خوام بینی ﷺ بەسەرە پەنجەو گرێ و جومگەکانی دەستە ڕاستی تەسبیحاتی دەکرد .

## ١٣٢- هەندێ خێرو چاکەو ئاداب

٢٦٧- ﴿إِذَا كَانَ جُنْحُ اللَّيْلِ -أَوْ أَمْسَيْتُمْ- فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَخَلُّوهُمْ، وَأَغْلِقُوا الأَبْوابَ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَفْتَحُ بَاباً مُغْلَقاً، وَأَوْكُوا قِرَبَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ، وَخَمِّرُوا آنِيَتَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضُوا عَلَيْهَا شَيْئاً، وَأَطْفِئُوا

(١) أخرجه أبو داود بلفظة ٨١/٢ والترمذي ٥٢١/٥ وانظر، صحيح الجامع ٢٧١/٤ برقم ٤٨٦٥ .

مَصَابِيحَكُمْ﴾ [1] .

**واته** : ئەگەر تاریکی شەو داهات یا ئێوارەتان کردەوە، منداڵەکانتان لەچوونە دەرەوەبگرنەوە، چونکە شەیتانەکان لەو کاتەدا بڵاودەبنەوە، دواتر ئەگەر کاتێك لەشەو ڕۆیی لێیان گەڕێن و دەرگاکان دابخەن، ناوی خوا بێنن، چونکە شەیتان دەرگای داخراوی پێ ناکرێتەوە، وە دەمی کوندەکانتان ببەستن، ناوی خوا بێنن، سەری قاپ و قاچاخ و دەفرو مەنجەڵەکانتان داپۆشن و ناوی خوا بێنن باسەریشتان داپۆشی بن یا شتێکتان بەسەردادابن و چراکانتان بکوژێننەوە .

لەکۆتاییدا درودو سەلام و بەرەکەت بڕژێ بەسەر موحەممەدی پێشەواو پێغەمبەرمان ﷺ و بەسەر سەرجەم خانەوادەو یارانی.

(١) البخاري مع الفتح ١٠/٨٨ ومسلم ٣/١٥٩٥ .

بسم الله الرحمن الرحیم

## دوعا و لەخوا پاڕانەوە بەهۆی ناوە جوانەکانی

خوای گەورە سەبارەت بە لەخوا پاڕانەوە بەناوە جوانەکانی خۆی لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ ﴾(الاعراف).

**واتە** : خوای گەورە چەندان ناوی بەرزو بەڕێزی هەن ، دەبەو ناوانە بانگ و هاواری خوای گەورە بکەن و داوای لێ بکەن و لەخوا بپاڕێنەوە ، بەڵکو لەبەر خاتری ناوە گەورەو جوانەکانی خۆی لێتان خۆش بێ ، وازبێنن لەو کەسانەی کە گۆڕانکاری و بێ ئایینی لە ناوەکانیدا دەکەن. لەئاییندەدا پاداشتی ئەو کارو کردەوانەیان وەردەگرن کەئەنجامیان دەدا.

## ناوە جوانەکانی خوای گەورە ئەمانەن

(اللە) واتە : خوا، خودا ، خوداوەند ، یەزدان.

(اللە) ناوی هەرە تاك و پیرۆزو گەورەو دیارو زانراوو باوی خوای گەورەیە، کۆکەرەوەی هەموو ناو و سیفەتەکانی تریەتی، اللە واتە، خوداو پەرستراوی بەهەق و شایستە.

(اللە) خوای گەورە ئەو خوایەیە تاك و تەنیاو بێ شەریك و هاوەڵە، خاوەنی ئەم ناو و سیفەتە بەرزو بەرێزو پاك و پیرۆزو گەورەو ئازیزو پڕ ماناو مەبەست و ناوەڕۆکانەیە کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوون [1].

**الرَّحْمَنُ** : بەخشندەو میهرەبان و بەسۆزو بەزەییە لەدونیا بەرانبەر بەهەموو شتێك لە بوونەوەردا.

**الرَّحِيمُ** : بەخشندەو میهرەبان و بەسۆزو بەزەییە لەدوا ڕۆژدا

---

(١) تێبینی :هەموو ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە لەهی ئینسان جیان ، بەمانای (مبالغة ومطلق) دێن ، بۆ ڕێنە (علیم) واتە : زۆر زاناو بەشێوەیەکی فرەو ڕەها زانا ، وەکو زانیاری (محدودو مقید)ی ئینسان نییە، هەروەها ناوەکانی تریش. هەر بەرمانایە دێن (وەرگێڕ).

بەرانبەر بە ئیمانداران و هەر شتێك کەخوا حەز بکا ڕەحمی پێ بکات.

**المَلِكُ** : هەمیشە پاشاو دەسەلاّتدارو سەرۆك و خاوەنی هەموو شتێکە لەبوونەوەرو دونیاو دوارِۆژدا.

**القُدّوسُ** : زۆر پاك و بێگەرد و بێ نەنگ و بێ‌کەم و کورِی و هەلّەو ناتەواوییە.

**السَّلَامُ** : زۆر ساغ و بێ گەردو بێ عەیب و ئاشتی خوازو ئاشتی دارو و ئاشتی پەروەرە.

**المُؤْمِنُ** : ئەمیندارو ئەمیندەرو دلّنیا کەری بڕوادارو دروستکراوەکانیەتی لە زەبرِ دلێدان و زیان پێ گەیاندنیان لە دونیاو دوارِۆژدا.

**المُهَيْمِنُ** : زۆر ئاگادارو چاودێرو دەسەلاتدارە بەسەر هەموو دروستکراو و بوونەوەردا.

**العَزِيزُ** : هەمیشە زالّ و دەسەلاّتدارو بەهێزو بە توانایە بەسەر بوونەوەردا.

**الجَبَّارُ** : زۆر دەسەلاّتدارو زەبر بەدەست و بەتواناو ناچارکەر.

**المُتَكَبِّرُ** : زۆر خۆ بەگەورە زان و زل و بەتواناو خۆ گەورە گرە

کە لەخۆی دەوەشێتەوە.

**الخالق** : دروست کەرو بەدیهێنەرە لە نەبوونەوە بۆ بوون.

**البَارِىء** : بەدیهێنەرو پارێزەری بوونەوەری بەدیهێنراوە.

**المُصَوِّرُ** : وێنە کێش و نیگار کێش و نەخشە کێشە بەجوانترین شێوە.

**الغَفَّارُ** : لێخۆشبەرو داپۆشەری گوناھ و تاوانەکان لە دونیاو دوارۆژدا.

**القَهَّارُ** : زۆر بەزەبرو بە دەسەلاّت و بەتواناو بەحوکم.

**الوَهَّابُ** : بەخشەرو بدەری بێ ئەندازە بەھەموو دروستکراوەکان.

**الرَّزَّاقُ** : رزق و رۆزی و بژێوی دەری بێ سنوورو کۆتا بەھەموو دروستکراوەکانی.

**الفَتَّاحُ** : دەروو کەرەوەو والاکەری ھەموو گەنجینەو دەروویەك.

**العَلِيمُ** : زاناو ئاگادارو بێ سنورر بەھەموو شتە ئاشکراو پەنھانەکانی ژیان و بوونەوەر.

**القَابِضُ** : بگرو وێکھێنەرو گوشەری ھەموو شتێکی بوونەوەر.

**البَاسِطُ** : ڕاکێشەرو فراوانکەرو لەدوو دەری ڕزق و ڕۆزی و پێویستیەکانی دروستکراوەکان.
**الخَافِضُ** : دابەزێنەرو دانەوێنەرو نەویکەرو لێ هێنەری پاشاو دەسەڵاتدارو زەبر بەدەستان.
**الرَافِعُ** : بڵند کەرو بەرز کەرەوەو سەرخەرو دەست گرو بارگری هەموو شتەکان.
**المُعِزُّ** : بەهێزکەرو زاڵکەر، هێزو دەسەڵات بەخش بەهەر شتێك کەبیەوێت.
**المُذِلُّ** : زەلیل و زەبوونکەرو سەرشۆڕکەرو رسواکەروملکەچ پێکەرو سەر پێدانەوێن.
**السَّمِيعُ** : بیسەرو گوێگری بی سنووری بوونەوەر.
**البَصِيرُ** : بینەرو دیدەی بێ سنووری هەموو شتەکانی بوونەوەر.
**الحَكَمُ** : دادوەرو دادگەرو فەرمانڕەواو ناوبژیوانی بەهەق و ڕاست.
**العَدْلُ** : دادگەرو دادپەروەرو هەق و ڕاست و بێ ستەم و لاگر.

**اللّطيفُ** : زۆر بەسۆزو لوتف و بەخشندەو میهرەبان.
**الخَبيرُ**: زۆر زاناو پسپۆڕو شارەزا لەهەموو شتەکانی ژیان‌و بوونەوەر.
**الحَليمُ** : زۆر نەرم و نیان و هێدی و هێواش و بەئارام و لەسەر خۆو بێ پەلە.
**العَظِيمُ** : زۆر گەورەو مەزن و بەتواناو بەهێزو بەدەسەڵات و شکۆدار.
**الغَفُورُ** : لێبوردەو لێخۆشبەرو گوناه و نهێنی داپۆش.
**الشَّكُورُ** : سوپاسگوزارو بەخشندەی خێرو چاکەو نازو نیعمەت.
**العَلِيُّ** : زۆر بەرزو بڵندو پایەدارو بەدەسەڵات.
**الكَبِيرُ** : گەورەو بەدەسەڵاتی بێ سنوور لەگەورەیی و دەسەڵاتدا.
**الحَفِيظُ** : پارێزەری دروستکراوەکانی لە تیاچوون و لەناو چوون‌و لەزیان پێ کەوتنیان.
**المُغِيثُ** : فریاد ڕەس و فریادکەرو بەهانا چووی دروستکراوەکانی.

**الحَسِيبُ** : ژمێریارو لێپرسەرەوەو نگاداری هەموو شتەکانی بوونەوەر.
**الجَلِيلُ** : بەرزو بەرێزو شکۆدار لەسەر هەموو بوونەوەر.
**الكَرِيمُ** : زۆر سەخی و بەخشندەو بەرێزو دەستکراوەو دەستڕۆو دەست والآ.
**الرَّقِيبُ** : ئاگادارو چاودێرو پەیدار بەسەر هەموو بوونەوەردا.
**المُجِيبُ** : وەلآمدەرەوەی هەموو پرس و داوحوازو ئارەزووەکانی دروستکراوەکانی.
**الوَاسِعُ** : زۆر فراوان و گوشادو بەسەلیقەو بەتوانا.
**الحكيم** : زۆر داناو زاناو کارزان و کاربەجێ و کار لەجێو وردو لێزان.
**الوَدُودُ** : زۆر بەسۆزو خۆشەویست و دۆستدار.
**المَجِيدُ** : زۆر پایە بەرزو سەر بەرزو سەر بلندو شکۆدارو بەرێز.
**البَاعِثُ** : زیندووکەرەوەو ژێنەرو نێرەرو گۆڕەری سەرجەم دروستکراوەکانیەتی.
**الشَّهِيدُ**: ئاگادارو زانا

**الحَقُّ** : ڕاست و دروست و هەق و هەقگۆ.

**الوَكِيلُ** : پشت و پەناو، دابینکەرەو دەستەبەرو فەراهەمهێنەرە.

**القَوِيُّ** : زۆر بەتواناو بەهێزو بەدەسەلآت و زاڵە بەسەر بوونەوەریدا.

**المتينُ** : زۆر بەهێزو پتەو و بەتواناو قایم و نەگۆڕە.

**الَوليُّ** : دۆست و پشتیوان و هاوکارو سەرپەرشتکار.

**الحَمِيدُ** : سوپاسکەری بەندەکانیەتی لەسەر چاکە کردن، بەندەکانیش سوپاسی خوا دەکەن لەسەر بەخشەکانی.

**المُحْصِي** : ژمێرەرو ئامارکەری هەمور شتەکانی بوونەوەرە.

**المُبْدِئُ** : داهێنەرو دروستکەرو دەستپێکەری سەرەتای دروست کردن و بوونەوەرە.

**المُعِيدُ** : گێڕەوەو دووپات کەرەوەی خەلق و بوونەوەرە بۆ حاڵەتی پێشوو و سەرەتا.

**المُحْيِي**: زیندووکەرەوە

**المُمِيتُ** : مرێنەرو لەناو بەری گیانلەبەرانی هەمور بوونەوەرە.

**أَلْحَيُّ**: زیندوو

**القَيُّومُ** : هەمیشە ڕاگرو بەرپاو ڕاوەستاوو ئامادەباش و، ڕێکخەرو بەڕێوەبەری بوونەوەر.

**الوَاجِدُ** : دروست کەرو بەدیهێنەرو فەراهەمهێنەری سەرجەم بوونەوەر، هەر لەکایەو هەر هەبوو.

**المَاجِدُ** : خاوەن پلەو پایەو شکۆو ڕێزی بێ شومار.

**الوَاحِدُ** : تاك و تەنیاو بێ هاوەڵ و بێ وێنە لە خودی خۆی و لەسەرجەم ناو و کردارو سیفەتە بەرزو بەڕێزەکانی لەچاو دروست کراوەکانی خۆی.

**الصَّمَدُ** : بێ نیازو مەبەست و جێی نیازو مەبەستو هیوا، لە هەموو دروستکراوەکانی بێ نیازو مەبەست و بێ منەتەو پێویستی بەهیچ شتێك نیە، جێی نیازو مەبەستی هەموو دروستکراوێکە، هەموو شتێك لە بوونەوەردا پێویستی بەوە.

**القَادِرُ** : زۆر بەتواناو بەدەسەڵات.

**المُقْتَدِرُ** : سەرچاوەی هەموو هێزو دەسەڵات و توانایەك لە بوونەوەردا بۆ دروستکراوەکانی.

**المقَدِّمُ** : پێشخەرو پێشهێنەر، هەموو شتێك دەزانێ پێش

هاتن و ڕودانی، دەتوانیّ هەمو شتێك وە پێش بخات.
**المؤَخِّرُ** : دواخەری گشت ڕوداو و پێشهاتەکانە، دەتوانیّ هەموو شتێك لەکاتی خۆی ڕاگریّ و دوا بخاو ڕوونەدات.
**الأَوَّلُ** : سەرەتاو یەکەمی هەموو شتێکە لە بووندا، هیچ شتێك لە بوونەوەر نەبووە، ئەو هەر هەبووەو بیّ سەرەتایە.
**الآخِرُ** : کۆتاو دوماهی هەموو شتێکە لەبووندا، هیچ شتێك لە بوونەوەردا نامێنیّ و کۆتایی پیّ دیّ، کەچی خوای گەورە هەر دەمێنیّ و بیّ کۆتایە و قەت لەناو ناچیّ و دوایی نایەت.
**الظَّاهِرُ** : دیارو ئاشکراو هەیە، لە ڕێگەی بوونەوەرە بوونی خۆی دەنوێنیّو پەی پیّ دەبرێت.
**البَاطِنُ**: نهێنی و نادیارو بزرو پەردە پۆش و شاراوەو نادیدەیە لەبەر چاوی دروستکراوەکانی.
**الوَالِيُ** : سەرپەرشتیارو پاشا و خاوەنی هەموو بوون و بوونەوەر.
**المُتَعَالِ** : زۆر بەرزو بەڕێزو پلەدارو بەدەسەلاّت و خۆ بەرز گر.

**البَرُّ** : چاکەکارو بەخشندەی بێ سنوور.
**التَّوَّابُ** : زۆر لێخۆشبوو و تۆبە وەرگرو لێبوردەیە.
**المُنْتَقِم** : تۆلە لێ سێنەرەوەی ستەمکاران و تاوانباران.
**العَفُوُّ** : لێبوردەو داپۆشەری گوناه و تاوان.
**الرَّؤوفُ** : زۆر بەسۆزو بەزەیی و بەڕەحمەت لەگەڵ دروستکراوەکانیدا.
**مَالِكُ المُلْك** : خاوەن و پاشاو فەرمانڕەوای هەموو ماڵ و موڵك و سەروەت و سامان و بوونێك لە بوونەوەردا.
**ذُو الجَلاَلِ وَالإكْرَامِ** : خاوەنی ئەو پەڕی ڕێزو پایەو شکۆ.
**المُقْسطُ** : دادگەرو دادپەروەرو دادڕەو لە حوکم و دەسەڵات و بڕیارو دابەشکردندا.
**الجَامِعُ** : کۆکەرەوەو گردکەرەوەو گشتگیری هەموو شتەکانی بوونەوەر.
**الغَنِيُّ** : زۆر دەوڵەمەندو بێ نیازو بێ ئاتاج و پێویستە لە هەموو شتێك.
**المُغْنِي** : دەوڵەمەندکەری خەڵك و بوونەوەرە، هەموو بوونەوەر پێویستی بە دەوڵەمەندی ئەوە.

**المَانِعُ** : بەرگری کار، پارێزکار.
**الضَّارُّ** : زیانبەخش و زیـان گەیەنـەرە بـە هـەر شـتێك کـە دەیەوێ.
**النَّافِعُ** : سـودبەخش و زۆر بەکـەڵك و بەسـورد بـۆ هـەمور بوونەوەر.
**النُّـورُ** : نـورو ڕونـاکی و چـراو درەخـشان و ڕوناککـەرەوەی بوونەوەرە.
**الهَـادِي** : هیدایـەت دەرو ڕێنمـایی کـەرو ڕاسـتکەرو ڕێپیشاندەری دروستکراوەکانە.
**البَدِيعُ** : ئافراندن و جوانکارو داهێنەری بوون و بوونەوەرە.
**البَـاقِي** : هەمیـشە بـەردەوام و هەرماوەیـەو قـەت لـەنێو ناچێت.
**الوَارِثُ** : میراتگری هەمور بوون و بوونەوەر، هـەمور شـتێك لەنێو دەچێ و هەر ئەو دەمێنێ.
**الرَّشِيدُ** : سەر ڕاست و ڕێناس و شارەزاو ڕێ نیشاندەرو ڕاستە ڕێ کارە.
**الصَّبُورُ** : زۆر بە ئارام و لەسەر خۆو خۆڕاگرە.

## خێرو پلەو پایەی دوعاو پاڕانەوە لەخوای گەورەو میهرەبان

خوای گەورە سەبارەت بەوە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ:

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾﴾ (غافر)

**واتە** : ئەی خەڵکینە پەروەردگاری ئێوە فەرموویەتی ئێوە هەمیشە بانگ و هاواری من بکەن، دوعا لە من بکەن و لەمن بپاڕێنەوە منیش وەڵامتان دەدەمەوەو داوار داخوازیەکانتان جێ بەجێ و گیرا دەکەم، چونکە بەڕاستی ئەو بەندانەی من کەخۆیان بەزل و فشۆل دەزانن لەمن بێ نیازو مەبەست بن، بەندایەتیم ناکەن، لەمەودوا دوای مردن بەسەر شۆڕی و زەبوونی دەچنە نێو ئاگری دۆزەخەوە.

دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى

﴿وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ ١٨٦﴾ (البقره)

**واته** : ئەی موحەممەد هەرکاتێ بەندەکانی من سەبارەت بەمن پرسیاریان لەتۆ کرد، ئەوا من بۆخۆم ئاگام لەوانەو لەوان نزیکم، ئەگەر بانگم بکەن وەڵامی داواو داخوازیەکانی داواکارو نزاکاران دەدەمەوە، دەبا ئەوانیش بەدەم منەوە بێن و، بڕوام پێبێنن، بەڵکو بەهۆی ئەوە ڕاستە ڕێ بن و هیدایەت بدرێن.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ)) دوعاو پاڕانەوە خۆی لەخۆیدا خودی عیبادەتە، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ادۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ﴾))[1]، هاوارو بانگ بکەن منیش وەڵامتان دەدەمەوەو بەدەنگ داواو بانگ کردنەکەتانەوە دێم، لەفەرموودەیەکی تریدا دەفەرموێ: ((إِنَّ رَبَّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى حَيِيٌّ كَرِيمٌ يَسْتَحْيِي مِنْ عَبْدِهِ إِذَا رَفَعَ

---

(١) أبو داود ٧٨/٢ والترمذي ٢١١/٥ وابن ماجه ١٢٥٨/٢ وانظر، صحيح الجامع صغير ١٥٠/٣ وصحيح ابن ماجه ٣٢٤/٢ .

يَدَيْهِ إِلَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْراً)) [1].

پەروەردگاری بەرزو باڵاتان بەخشندەو زیندووەو، شەرم لە بەندەکەی دەکا، ئەگەر دەستەکانی بۆ بەرز بکاتەوەو لێی بپاڕێتەوەو داوای لێبووردن و لێخۆشبوونی لێبکا، ئەویش ناوا دەستەکانی بە بەتاڵی و بێ ئومێدو بەسفرو بێ هودە بگێڕێتەوەو لێی قەبول نەکاو داواکەی گیرا نەکات.

**دیسان فەرموویەتی:** ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو اللهَ بِدَعْوَةٍ لَيْسَ فِيهَا إِثْمٌ وَلاَ قَطِيعَةُ رَحِمٍ، إِلاَّ أَعْطَاهُ اللهُ بِهَا إِحْدَى ثَلاَثٍ : إِمَّا أَنْ تُعَجَّلَ لَهُ دَعْوَتُهُ، وَإِمَّا أَنْ يَدَّخِرَهَا لَهُ فِي الآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يَصْرِفَ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهَا))

**واتە :** هەر موسڵمانێك داوایەك لەخوای گەورە بکار لێی بپاڕێتەوە ئەگەر داواکەی گوناه و تاوان و پچڕانی سیلەی ڕەحمی تیانەبێ، خوای گەورە یەکێك لەم سێ شتانەی پێ دەبەخشێت، یا بەپەلە داواکەی گیرا دەکات، یا داواکەی بۆ هەڵدەگرێ بۆ ڕۆژی دوایی و لەوێ بۆی گیراو دەکا شتەکەی

---

(١) أخرجه أبو داود ٧٨/٢ والترمذي ٥٥٧/٥ وابن ماجه ١٢٧١/٢ وقال ابن حجر سنده جيد ، وانظر، صحيح الترمذي ١٧٩/٣ .

پێ دەبەخشێ و بۆی قـەرەبوو دەکاتـەوە، یـا وەکـو داواکـەی شتێکی خراپ و گوناهی لەسەر لادەبا، سەحابەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەواتە زۆر دوعا بکـەین چـاکە؟، ئەویش فەرمووی : بەلێ خوا زۆر دەوڵەمەنـدو بەخـشندەیە، تا ئێوە زۆر دوعا بکەن ئەویش زۆر بەئێوە دەبەخشێ و لێتان خۆش دەبێ.

## هەندێ لە ئادابەکانی دوعا و هۆکارەکانی گیرا بوون

پێویستە لەکاتی دوعا کردن و لەبەر خوا پاڕانەوە، لەهەموو کاتەکاندا ئەم ئاداب و شێوازانە ڕەچـاو بکـرێن، بـۆ ئـەوەی دوعاکان شەرعی بن و خوای گەورە پێیان ڕازی بێ و گیرایان بکات :-

١- بەدڵسۆزی بۆ خوا بکرێن.

٢- بەحەمدو سەنا بۆ خوای گەورەو پاشان بە سـەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەست پێ بکرێ و هەر بە سەلاواتیش کۆتایی پێ بهێنرێ.

٣- خـۆ یـەکلایی کردنـەوە لـە دوعـاداو یـەقین هـەبوون

لەوەرگرتندا.
٤- پێداگیری و سووربوون لە دوعا کردن و پەلە نەکردن لـە وەڵام دانەوە.
٥- دوعا کردن بەدڵ، لەکاتی دوعا دەبێ دڵت لەلای دوعاو پاڕانەوەکە بێت، واتە بەدڵ دوعا بکە، لەکاتی دوعاکردنـدا دڵ و زمانت یەك بێ.
٦- دوعا کردن لەکاتی خۆشی و ناخۆشی و تەنگانەدا، نەك دوعـا تـەنها لـەکاتی تەنگانـە بکـرێ، لـەکاتی خۆشـی و ئاسوودەیش خوا لەبیر بکرێت !
٧- داوا لەکەس مەکەو لەکەس مـەپاڕێوە، تـەنها لـەخوای تاك و تەنیا نەبێت.
٨- دوعا لەخۆو لەخانەوادەو سامان و منداڵت مەکە.
٩- لەکاتی دوعا دەنگت نزم بکە لەنێوان دەنگ دەرچوون و دەنگ نزمیدا.
١٠- داننان بەهەڵەو تاوان و گوناهەکان، داوای لێبـوردن و لێخۆشبوون لە گوناهەکان لـەخوای گـەورە، داننـان بـەنازو

نیعمەت و بەخششەکانی خوای گەورە، سوپاس کردنــی خــوا لەسەر ئەو نازو نیعمەتانە.

١١- زۆری لــەخۆ نــەکردن بــۆ ڕێکخــستنی دەســتەواژەو دەربڕینەکانی دوعاو وەزن و قافیەکانی.

١٢- زەلیلی و ملکەچی و ترسان و ئارەزوو مەندی پیشاندان لەدوعا بۆ خوای گەورە.

١٣- هەق دانــەوەی ســتەم لێکــراوان، وێــڕای تەوبــەکردن و پەشیمان بوونەوە لەو ستەم و تاوانانەی کە کردوتە.

١٤- هەر دوعایەك سێ جار دووبارەی بکەوە.

١٥- ڕووکردنە ڕووگە (قیبلە) لەکاتی دوعا کردن.

١٦- دەست بەرز کردنەوە لە دوعادا بن هەنگڵەکان دیارین.

١٧- ئەگەر گونجا دەست نوێژ گرتن پێش دوعا.

١٨- نابێ لە دوعا کردنــدا دەســت درێــژی بکــرێ، دوعــای خراپ لە خەڵکی بکرێت.

١٩- دەبێ دوعاگۆ سەرەتا دوعا بــۆ خــۆی بکــا ئەوســا بــۆ

غەیری خۆی[1].

٢٠- پاڕانەوە لەخوا بەناوە جوانەکانی خواو بەسیفەتە بەرزو بەڕێزەکانی خوا، یا بەکارو کردەوەیەکی چاك و باش کە دوعاکەر لەژیانیدا کردوویەتی، یا بە دوعای پیاو چاکێکی زیندوو بۆ تۆ یا بۆ کەسێك بکات.

٢١- پێویستە دوعاکار خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگەکانی حەلاڵ بن.

٢٢- نابێ دوعا گۆ دوعای گوناه و تاوان و پچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ خزم و ناسیاوانیدا بکات.

٢٣- دەبێ لەکاتی دوعادا فەرمان بەچاکە بکاو نەهی لەخراپە بکات.

٢٤- خۆ دوورگرتن لە هەموو گوناه و تاوانێك لەکاتی دوعا کردندا.

---

(١) لەپێغەمبەر (ﷺ) چەسپاوەکە کە لەدوعاکردندا سەرەتا لەخۆیەوە دەستی پێکردووە، بەهەمانی شێوە چەسپاویشە کەوا سەرەتا لەخۆیەوە دەستی پێنەکردووە وەکوو دوعاکردنی بۆ ئەنەس و ئیبنو عەبباس و، دایکی ئیسماعیل و،هی دیکەش، بڕوانە درێژەی ئەم باسە لە ڕاڤەکردنەکەی نەوەوی بۆ سەرحیحی موسلیم (١٥/١٤٤و توحفەی ئەحودزی ڕاڤەی سونەتی ترمزی ٩/٣٢٨و بوخاری لەگەڵ فەتح دا ١/٢١٨.

## ئەوكات و شوێن و حاڵەتانەی کە دوعایان تیادا گیرا دەبێت:

١- لەشەوی قەدردا.

٢- کۆتایی شەودا.

٣- لەدوای نوێژە فەرزەکان.

٤- دوعاکردن لە نێوان بانگ و قامەتدا.

٥- کاتێك هەیە لەهەموو شەوێکدا دوعای تێدا قەبوول دەبێت.

٦- کاتێ بانگی نوێژە فەرزەکان دەدرێ.

٧- کاتی باران بارین.

٨- کاتێ لەپێناو خوا ڕیزەکانی سوپای موجاهیدانی ئیسلام ڕێك دەخرێن و بەرەو جیهاد دەبرێن.

٩- کاتێك هەیە لە ڕۆژانی هەینیدا دوعای تێدا گیرا دەبێ. سەبارەت بەو کاتە هەندێ ڕای بەهێزو بەڵگەدار هەیە ئەم کاتە دواکاتەکانی عەسری ڕۆژی هەینیە، بەڵگەش هەیەکاتی وتاردان و نوێژی هەینیە.

١٠- دوعـــا كـــردن لـــه‌كاتی خواردنـــه‌وه‌ی ئـــاوی زه‌مـــزه‌م به‌نیازێكی پاك و ڕاست.
١١- دوعا كردن له‌كاتی سوجده‌دا.
١٢- دوعاكردن كاتی به‌خه‌به‌ر هاتن له‌خه‌وی شه‌وان.
١٣- ئه‌گـــه‌ر ئینـــسان به‌ده‌ســـت نوێـــژه‌وه بخـــه‌وێ، پاشـــان به‌خه‌به‌ربێ، دوعا بكا.
١٤- دوعا كردن به ئایه‌تی (لا الـه الا انـت سـبحانك إنـی كنت من الظالمین).
١٥- دوعاكردنی خه‌ڵك له‌پاش مردنی كه‌سێك.
١٦- دوعاكردن لـه‌دوای سـوپاس و سـتایش كردنـی خـوار سه‌لاوه‌ت لێدان له‌سه‌ر دیداری پێغه‌مبـه‌ر ﷺ له‌تـه‌حیاتی كۆتادا.
١٧- دوعاكردن به‌ناوی هه‌ره گه‌وره‌ی خـوا، چـونكه ئه‌گـه‌ر دوعا به‌و ناوه بكرێ، ئه‌وا گیرا ده‌بێ، وه ئه‌گه‌ر داوایه‌كی پێ بكرێ، ئه‌وا پێی ده‌درێت[1].

---

(١) به‌مه‌به‌ســتی دوعــا كــردن بــه‌ناوی هــه‌ره گــه‌وره‌ی پــه‌روه‌ردگار، لــه‌م ناميلكه‌يه‌دا ته‌ماشای فه‌رمووده‌ی ژمارد (٩٣/ ٩٤، ٩٥) بكه‌.

١٨- دوعا كردنى موسڵمان بۆ برا موسڵمانەكەى، بێ ئەوەى ئاگاى لێبێت.
١٩- دوعاى ڕۆژى عەرەفە لە حەجدا لە سەر چياى عەرەفە.
٢٠- دوعا كردن لەمانگى ڕەمەزاندا بەگشتى.
٢١- دوعا كردن لەكاتى كۆبوونەوە لە كۆڕو دانيشتنەكانى زيكركردنى خوا.
٢٢- دوعا كردن لەكاتى هاتنى بەلاَو موسيبەت، بە وتەى (إنا لله وإنا إليه راجعون، اللهم أجرني في مصيبتي واخلف لي خيراً منها). واتە: ئێمە بەهەموو شتێكمانەوە هى خواين، هەر بۆ لاى ئەويش دەگەڕێينەوە، خوايە لەو بەلاَى بەسەرم هات خێر بارم بكە، پاداشتم بدەيتەوە، باشتر لەوەم پێ بدەوەو بۆم پڕ بكەوە.
٢٣- دوعاكردن لەو كاتەى كەدڵ زۆر بەپاكى و دڵسۆزى ڕو لەخوا دەكات.
٢٤- دوعاى ستەم لێكراو لەو كەسەى ستەمى لێكردووە.
٢٥- دوعاى دايك و باوك لە منداڵەكانى و دوعا كردنيان

بۆ منداڵەکانیان.
٢٦- دوعای گەشتیار تا لەگەشتەکەی دەگەڕێتەوە ماڵەوە.
٢٧- دوعای ڕۆژوو گر کاتێك بە ڕۆژووە.
٢٨- دوعای ڕۆژوو گر کاتی ڕۆژووەکەی دەشکێنێ.
٢٩- دوعای زۆر لێکراو و ناچار کراو.
٣٠- دوعای سەرکردەو پێشەوای دادگەر.
٣١- دوعای منداڵی چاك بۆ دایك و باوکی.
٣٢- دوعای دوای دەست نوێژ هەڵگرتن.
٣٣- دوعاکردن دوای ڕەجم کردنی شەیتانی گچکە لەحەج.
٣٤- دوعا کردن پاش ڕەجم کردنی شەیتانی ناوەنجی.
٣٥- دوعا کردن لەناو کەعبەو لەناو حجری إسماعیـل دوای نوێژ کردن لەوێ.
٣٦- دوعاکردن لەسەر تەپۆلکەی سەفا لە مەککە.
٣٧- دوعاکردن لەسەر تەپۆلکەی مەڕوا لە مەککە.
٣٨- دوعا کردن لەلای مشعر الحرام لە موزدەلیفە.
جگە لەو حاڵەت و کات و جێیانەش، ئیمانداران هەمیشە

لەهەر کوێ و حالەتێك بن داواو پاڕانەوە لەخوا دەکەن، چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِي وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾( البقرة).

**واتە** : ئەی موحەممەد ﷺ ئەگەر بەندەکانم پرسیاری منیان لەتۆ کرد، ئەوا من ئاگادارو نزیکم لەوان، هەر داواکارێك داوایەکم لێ بکاو هاوارو بانگم بکاتێ، وەڵامی داواکەی دەدەمەوەو، بەدەم بانگەوازەکەیەوە دەچم و هاوکاری دەکەم لەهەموو کات و ساتێکدا.

بەڵام ئەو کات و سات و حاڵەتانە لە فەرموودەکاندا زیاتر گرنگیان پێدراوە، بۆ دوعا تیادا کردن و قەبول بوونیان.

## چەند دوعایەك لە قورئان و سوننەتدا هاتوون.

ئەم دوعایانــەی کــە ئێستا دەیانخەینــە ڕوو، وەکــو دەق لــە قورئــان و ســوننەدا هــاتوون، بۆیــە تــا دەکرێت پێویــستە ئینسانی ئیماندار ئەم دوعایانە بکات.

*** ئەو دوعایانەی لە( قورئان )دا هاتووە:**

**الْحَمْدلِله وَحْدَهُ وَالصَّلاةُ والسَّلاَمُ علَىَ مَنْ لا نَبِيَّ بَعْدَهُ :-**

١- ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾ (الأعراف).

**واتە :** خوایە ئێمە بــەهۆی گونــاه و تاوانــەکانمان ســتەمان لەخۆمان کرد خۆمان شایستەی دۆزەخ و نــا ڕەزامەنــدی تــۆ کرد، بەڕاستی ئەگەر تۆ لێمان خۆش نەبی و لێمان نەبووری و ڕەحمان پێ نەکەی، زۆر زۆر زەرەرمەندو ماڵ وێران دەبین.

٢- ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى

بِهِۦ عِلۡمٌۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِى وَتَرۡحَمۡنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَـٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ (هود).

**واته** : حەزرەتی نوح (علیه السلام) بە پەروەردگاری گـوت: ئەی پەروەردگارا پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی کەمن داوایـەکت لیٚ بکەم کەنایزانم و زانیاریم پیٚی نیە، ئەگـەر لـیٚم نـەبووری و ڕەحمم پیٚ نەکەی بەڕاستی زۆر زەرەرو زیان دەکەم.

٣-﴿رَّبِّ ٱغۡفِرۡ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيۡتِىَ مُؤۡمِنًا وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَـٰتِ ﴿٢٨﴾ ﴾ (نوح).

**واتــه** : حــەزرەتی نــوح بــەخوای خــۆی فــەرموو : ئــەی پــەروەردگارم دە لــەمن و لــەدایك و بــاوکم خۆشــبە، لــەو کەسەش خۆش بە کە بە ئیمانداری دیٚتە لام و ماڵەوەم، لــە هەموو پیاو و ژنە بڕوادارەکان خۆشبە.

٤- ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾

﴿وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١٢٨﴾ (البقرة).

**واته: كاتێ كه حهزرهتی ئیبراهیم لهگهڵ ئیسماعیلی كوڕی بناغهو ڕێسای ماڵی خوایان ههڵدهنا گوتی: خوایه دوعاو عیبادهت و كارو كردهوه چاكهكانمان لێ گیرا بكه، بهڕاستی ههر تۆ تاكه بیسهرو زانای، تهوبهو پهشیمانیمان لێ قهبوول بكه، چونكه ههر تۆ لێخۆشبووڕێكی بهبهزهیی و تهوبه قهبول دهكهی.**

٥- ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ ٤٠﴾ (إبراهيم).

**واته : حهزرهتی ئیبراهیم بهخوای خۆی فهرموو: ئهی پهروهردگارم من و ڕۆلهو وهچهكانم وا لێ بكه زۆر بهباشی نوێژهكان جێ بهجێ بكهین.**

٦- ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ ٤١﴾ (إبراهيم).

**واته** : حەزرەتی إبراهیم بەخوای گوت : ئەی پەروەردگارمان دە لەمن و ڕۆڵەکانم و لە ئیماندارانن خۆشبە لەو ڕۆژەی لێپرسینەوەی تیدا دەکرێ.

٧- ﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴿٨٣﴾ وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَاجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَاغْفِرْ لِأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ ﴿٨٧﴾﴾ (الشعراء).

**واته** : حەزرەتی إبراهیم (علیه السلام) بەخوای گوت : ئەی پەروەردگارم حوکم و داناییم پێ ببەخشە، بەپیاو چاکانم بگەیێنە، لە نێو گەلانی داهاتوودا ڕاستگۆییم پێ ببەخشە، بمکە میراتگرانی بەهەشتی پڕ لەنازو نیعمەتی خۆت، لە باوکم خۆش بە کەلەگومڕایانبوو، و لەرۆژی زیندووکردنەوەدا سەرشۆڕو شەرمەزارم مەکە.

٨- ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ (الصافات)

**واتە : حەزرەتی إبراهیم گوتی : ئەی پەروەردگارم منداڵی چاکم پێ ببەخشە.**

٩- ﴿ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤﴾ ﴾ (الممتحنة).

**واتە : پەروەردگارمان هەرتۆ پشت و پەنامانی پشتمان بەتۆ بەست، بۆ لای تۆ گەڕاینەوەو پەشیمان بووینەوە، چارەنووس و گەڕانەوەمان هەر بۆ لای تۆیە.**

١٠- ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٥﴾ ﴾(الممتحنة).

**واتە : خوایە نەمانکەیتە مایەی ئاشوب و ئاژاوە و نەشکەنجە بۆ ئەو کەسانەی بێ باوەڕن بەجۆرێ لەبەر ئێمە ئیمان نێنن، پەروەردگارمان دەلێمان خۆشبە، بەڕاستی تۆ زۆر زاڵ و دەسەلاَتدارو داناو زاناو کار بەجێی.**

١١- ﴿قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩﴾﴾ (النمل).

**<u>واته</u> : حەزرەتی سلێمان گوتی : ئەی پەروەردگارم وام لێبکە هەمیشە سوپاس و ستایشت بکەم لەسەر ئەو نازو نیعمەتانەی بەسەر من و دایکم و باوکمتدا رشتوونە، هەمیشە کارو بارێکی وا چاك بکەم تۆ پێی ڕازییت، بەرەحمەت و سۆزی خۆت بمخەرە نێو ڕیزو بازنەی بەندە چاکەکانی خۆت.**

١٢- ﴿ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾﴾(آل عمران)

**<u>واته</u> : حەزرەتی زەکەریا بەخوای گەورەی گوت : ئەی پەروەردگارم دە لەلایەن خۆتەوە کوڕێکی سروشت پاك و**

پیرۆزم پێ ببەخشە، بەڕاستی هەر تۆ گوێگرو بیسەرو گیراکەری دوعاو پاڕانەوەو داواکاری بەندەکانتی.

١٣- ﴿ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾ (الأنبياء).

**واتە** : حەزرەتی زەکەریا بەخوای گوت، ئەی پەروەردگارم بەتەنیا مەمهێڵەوە، بەڵکو منداڵێکی چاك و پاکم پێ ببەخشە، تۆ چاکترینی میراتگرانی، ئەوانەی میراتت لێ دەگرن، چونکە هەموو کەس و شت دەمرێ تەنها خوای پەروەردگار دەمێنێ.

١٤- ﴿ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ (الأنبياء).

**واتە** : حەزرەتی یونس کاتێ لەبەر گەلەکەی لەشاری نەینەوا ڕۆیشت، دەرەنجام لە دەریا کەوتە نێو زگی نەهەنگ، ئەوسا وتی : ئەی خودایە هیچ خوایەکی بەهەق و شایستە نیە تەنها تۆ نەبی، پاکیی و بێگەردیی بۆ تۆ، بەڕاستی من

لەستەمکاران بووم.

١٥- ﴿قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ۝٢٥ وَيَسِّرْ لِىٓ أَمْرِى ۝٢٦ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِى ۝٢٧ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِى ۝٢٨﴾( طه).

**واته** : کاتێ موسا (علیه السلام) بۆ گفتوگۆ چووە لای فیرعەون و دارو دەستەکەی، دوعا لەخوا دەکاو دەڵێ : خوایە دڵ و دەروونم بۆ فراوان و والا بکە، کاروبارەکانم بۆ ئاسان و فەراهەم بکە، زمانم پاراو بکە بۆ ئەوەی بتوانم باش بدوێم و قسە بکەم و زمانم نەگیرێ، تا قسەکانم نەستەق و بەجێ و پاراوبن و لە قسەکانم تێ بگەن.

١٦- ﴿رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى ۝١٦﴾( القصص)

**واته** : دوای ئەوەی کە حەزرەتی عیسا لەماڵ و دەسەڵاتی فیرعەون ڕای کردو، لەنێو شار بە بۆکزێك پیاوێکی قیبطی کوشت، وتی : ئەی خوای پەروەردگارم بەڕاستی من ستەمم

لەخۆ کرد ئەم کارەم کرد ، دەتۆش لـێم خۆشـبە ئـیتر خـوای گەورەش لێی خۆش بو و عەفوی کرد.

١٧- ﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾﴾ (آل عمران).

**واتـه** : هـەوادارو حەواریـەکانی حـەزرەتی عیـسا (علیـه السلام) دوای ئەوەی کە بڕوایان بـە عیـسا هێنـا گوتیـان : ئەی پەروەردگارمان ئێمە ئیمانمان بەوە هێنا کە داتبەزاندووە بۆ پێغەمبەرەکەت، وە بەدوای پێغەمبەرەکەی تۆش کەوتین و و پەیڕەویمان لێ کرد ، دە لەگـەڵ بـڕوادارە گەواهیـدەرەکانمان بنووسەو حسێب بکە.

١٨- ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾﴾( یونس).

**واتە** : ئەوانەی بڕوایان بە حەزرەتی موسا هێنـا گووتیـان : ئەی پـەروەردگارمان مەمانکـە مایـەی ئاشـوب و ئـازارەو

ئەشكەنجە بۆ گەلی ستەمكاران، وە بەرەحم و سۆزی خۆت لەدەستی خەڵكی كافر ڕزگارمان بكە.

١٩- ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٤٧﴾(آل عمران).

**واتە** : ئەوانەی كە لەگەڵ پێغەمبەراندا (علیه السلام) لەدژی بێباوەڕاندا دەجەنگن، دەیانگوت : پەروەردگارمان دە لەگوناھ و تاوانەكان و زێدەڕۆییانەمان خۆشبە كە لە كاروبارەكانماندا كردوومانە، لەبەرانبەر بێ باوەڕان لەجەنگدا خۆڕاگرو لاق جێگیرو چەسپارمان بكە، بەسەر گەلی بێ باوەڕاندا سەرمان بخە.

٢٠- ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةٗ وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا ١٠﴾ (الكهف).

**واتە** : ئەو كۆمەڵە گەنجەی لە قورئاندا بە یارانی

ئەشکەوت (أصحاب الكهف) ناوبراون، کاتێ پـەنایان بـردە بەر ئەشکەوتەکە گوتیان : ئەی پـەروەردگارمان دە لەلایـەن خۆتەوە ڕەحمەتێکمان پێ ببەخشە، لەو کارو بارو دۆخەی کـە تیاییداین، ڕێگەیەکی ڕاست و ڕزگـار بەخـشمان بـۆ سـازو فەراهەم بکە.

٢١- ﴿رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾ (طه).

<u>واتە</u> : خوای گەورە بە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێ: : ئەی موحەممەد : هەمیشە بڵێ : پـەروەردگارا زانـست و زانیـاریم زیاد بکە.

٢٢- ﴿وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾﴾ (المؤمن).

<u>واتە</u> : خوای گەورە بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: ئـەی موحەممەد بڵێ : ئەی پەروەردگارم بەتۆ خـۆم لـە وەسوەسـەو خوتخوتـەو خەتـەرەی زەرەرو زیـان و خراپـەی شـەیتانەکان دەپارێزم، بەتۆ خۆم لەوە دەپارێزم، شەیتانەکان لەکاتی سەرە

مەرگ و هەموو کاتەکانی ژیانم لەلام ئامادەبن و زەل و زەفەرم پێ ببەن و لا ڕێم نەکەن.

٢٣- ﴿رَّبِّ ٱغۡفِرۡ وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ١١٨﴾ (المؤمن).

<u>**واتە**</u> **: خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرمووێ:، ئەی موحەممەد بڵێ : ئەی پەروەردگارم دەلێم خۆشبەو ڕەحم پێ بکە، چونکە تۆ باشترین بەخشندەو میهرەبانی.**

٢٤- ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١﴾ (البقرة).

<u>**واتە**</u> **: ئەوانەی بەدوای پێغەمبەر ﷺ کەوتن، گوتیان : بڕوامان هێناو گوێمان لە پەیام و پێغەمبەرەکەت بوو، پەیڕەوی و گوێڕایەلیمان کرد، دەلێمان خۆشبە، چارەنووس و گەڕانەوەکان هەر بۆ لای تۆیە.**

٢٥- ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ

وَٱلْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ ﴾ (البقرة)

**<u>واته</u>: ئەو ئیماندارانەی بڕوایـان بـەخواو بەپێغەمبەرەکـەی هێنـــا گوتیـــان: گوێمـــان لـــەفرمانو پەیامەکـــەبوو، وەگوێرایەڵیو فەرمانبەرێمان کرد، خوایە داوای لێخۆشـبوون لە تۆ دەکەین، دەڵێمان خۆشبە، گەڕانەوەو چارەنووسمان هەر بۆ لای تۆیە.**

٢٦- ﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ

ٱلۡكَـٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ ﴾ (البقرة)

**واتــه** : ئـەو ئیمانداراننـەی کـە بڕوایـان بـەخواو پـەیام و پێغەمبەرەکەی هێنا گوتیان : ئـەی پـەروەردگارمان لێمـان مەگرە ئەگەر کـارو فرمانێکمـان لـەبیر چـوو و نـەکرد یـا بەهەلـەو نـەزانی گونـاه و تاوانێکمـان کـرد ، خوایـە کاروبـارێکی وا قـورس و گرانمـان لەسـەر دامـەنێ پێمـان هەڵنەستێ و پێمان نـەکرێ، وەکـو ئەوانـەی لـەپێش ئێمـە لەسەرت داناون، خوایە دەردو بـەلاو پـەتای وامـان بەسـەر مەیەنە بەرگەی نـەگرین و لـە توانامانـدا نـەبێ، دەلێمـان ببورەو، لێمان خۆشبەو، ڕەحمان پێ بکە، هەر تۆ تاکە پشت و پەناو سەرخەرمانی، دەبەسـەر گـەلی کـافرو سـتەمکاردا زاڵمان بکەو سەرمان بخە.

٢٧- ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٨﴾ ﴾ (آل عمران).

**واته** : ئیمانداران دوای ئەوەی خوای گـەورە هیدایـەتی دان،

دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان، دوای ئەوەی کە هیدایەتت داین، دڵمان لەسەر ئەو هیدایەت و ڕێگە ڕاست و پاکە لامەدەو مەمان گۆڕە، دەلەلای خۆتەوە ڕەحمەتێکمان پێببەخشە، بەڕاستی تۆ بەخشندەو میهرەبانی.

٢٨- ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾

(آل عمران).

**واتە** : ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ ئەم ئەرزو ئاسمان و

بوونەوەرەت بەخۆرایی و بەبێ هودە دروست نەکردووە، پـاکی و بێگەردی بۆتۆ، دە لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپـارێزە، ئـەی پەروەردگارا، بەڕاسـتی هـەر کەسـێك کـەتۆ بیخەیتـە نێـو ئاگری دۆزەخەوە، دیـارە ئـەو کەسـەت سـەر شـۆڕو ڕسـواو خەجالەت بار کردووە، لەو ڕۆژەدا ستەمکاران هـیچ پـشت و پەنایەکیان نیە، ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە گوێمـان لە بانگخوازێك بوو کە بۆ بڕوا هێنان بانگی خەڵکی دەکردو دەیگوت : ئەی خەڵکینـە دە ئیمـان بـە پەروەردگارەکـەتان بێنن ئێوەو هەموو بوونەوەری دروستکردووە، ئەوسا ئێمـەش ئیمانمـان پـێ هێنا ،ئـەی پـەروەردگارمان دەلـەگوناه و تاوانەکانمان خۆشبە، تاوان و خراپەکانمان لێ بسڕەوەو لەگـەڵ چاکەکاراندا بمـان مرێنـە، ئـەی پـەروەردگارمان دەکەراتـە لەدوای مـردن ئـەوەمان پـێ بـدە کـە لەسـەر زارو زوبـانی پێغەمبەرەکانت بە لێنت پێ داوین، لەڕۆژی دواییدا هەرگیز ڕیسواو سەر شۆڕمان مەکـە، بێگومـان تـۆ بـەلێنی خـۆت ناشکێنی و جێبەجێی دەکەی.

٢٩- ﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ١٠٩﴾ (المؤمن)

**واتە : ئیماندار دەڵێ : ئەی پەروەردگارمان ئێمە ئیمانمان هێنا، دە تۆش لە گوناھ و تاوانەکانمان خۆشبەو ڕەحممان پێ بکە، چونکە تۆ باشترین میهرەبانی.**

٣٠- ﴿رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ٦٥ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرًّا وَمُقَامًا ٦٦﴾ (الفرقان).

**واتە : ئیمانداران دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان دە سزای دۆزەخمان لێ لادەو لێمان دوورخەوە، چونکە بەڕاستی سزای ئەم دۆزەخە هەمیشە بەردەوام و لا نەچووە، وە بەڕاستی ئەم دۆزەخە خراپترین شوێن و جێگەی تیا مانەوەو تێدا ژیانە.**

٣١- ﴿رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ

﴿وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾﴾ (الفرقان)

**واته** : خوایه ده له خێزان وەچەو ڕۆڵەکانمان چاو ڕوونیمان پێ ببەخشە، ئەو مندالأنەی چاومان پێ گەش و ڕووناك دەبێتەوە، بمانکە سەرکردەو پێشەوای پارێزگاران و لەخوا ترسان.

٣٢- ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾﴾(الأحقاف).

**واته** : ئینسانی ئیماندار کاتێ دەگاتە هەرەتی پێگەیشتن، دەڵێ : خوایە لەسەر ئەوە ڕام بێنە هەمیشە سوپاس و ستایشت بکەم لەسەر ئەو نازو نیعمەتانەی بەسەر من و دایك و باوکمدا ڕشتووتە، ڕام بێنە لەسەر ئەوەی هەمیشە لە ژیاندا کاری چاك بکەم جێی ڕەزامەندی ئێوە بێ، خوایە ڕۆڵەو وەچەکانم چاك و باش و پەسەند بکە، خوایە من

گەڕامەوە لای تۆ، خوایە من یەکێکم لە موسڵمانان.

٣٣- ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ (الحشر).

**واتە** : خوایە دە لە ئێمەو لەو برایانەمان خۆشبە کە پێش ئێمە ئیمانیان هێنا، خوایە هیچ ڕق و کینەو فڕو فێڵێکمان مەخە ناو دڵ و دەروونمان دەربارەی ئیماندران، خوایە گیان بەڕاستی تۆ زۆر لێخۆشبوو بەبەزەیی.

٣٤- ﴿رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾﴾ (التحريم)

**واتە:** خوایە ڕووناکیمان بۆ زیادو زۆر بکە، لێمان خۆش بە، بەڕاستی تۆ لەسەر هەمووشتێك تواناداروو بەدەسەڵاتی.

٣٥- ﴿رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ

ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ﴾( آل عمران)

**واتە** : خوايە، ئێمە ئیمانمان بەتۆ هێنا، دەتۆش لەگوناه و تاوانەكانمان خۆشبە، لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

٣٦- ﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ (المائدة)

**واتە** : خوایە ئێمە ئیمانمان هێنا، دەتۆش ناومان لەگەڵ بڕواداره گەواهیدەرەكان بنووسە.

٣٧- ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا ٱلۡبَلَدَ ءَامِنٗا وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ﴿٣٥﴾﴾ (إبراهيم).

**واتە** : حەزرەتی ئیبراهیم گوتی : خوایە ئەم شارە كە مەككەیە بكە شارێكی پڕ لە ئارام و ئاسایش، خوایە من و ڕۆڵەكانم بپارێزەو دوور بگرە لەوەی بت بپەرستین.

٣٨- ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ﴿٢٤﴾ ﴾ (القصص).

**واتە** : حەزرەتی موسا لە تەنگە تاویی و شەكەتیان لە ژێر سێبەرێك گوتی : ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من هەژار و

ئاتاجم، پێویستیم بەهەر خێرو بێرو رزق و رۆزییەك هەیە بۆم بنێری تا لێی تێرو بەهرەمەند بم.

٣٩- ﴿ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (العنكبوت)

**واتە** : خوایە بەسەر گەلی خراپەکارو تێکدەران سەرم بخەیت.

٤٠- ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ (الأعراف).

**واتە** : خوایە لەگەڵ خەڵکی ستەمکارمان دامەنێ و حسێب مەکە.

٤١- ﴿حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾ ﴾(التوبة)

**واتە** : بەتەنیا خوام بەسە، هیچ خوایەکی بەهەق و شایستە نیە جگە لەو خوایەی تاك و تەنیاو بێ شەریکە، پشت و پەنامان هەر بەوە، ئەو خوایە پەروەردگاری عەرش و بارەگای گەورەو مەزنە.

٤٢- ﴿قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾﴾ (القصص).

**واته : كاتىَ كه حهزرهتى موسا بهرهو شارى مهدينه دهرۆيشت، دهيگوت : ئوميَد دهكهم خواى پهروهردگارم بهرهو ريَگايیهكى ههق و راسته رِىَ رِيَنمايم بكات.**

٤٣- ﴿رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾﴾ ( القصص).

**واته : حهزرهتى موسا كاتىَ كهلهشار پياوه (قبطي)يهكهى كوشتوو لهخۆشاردنهوهدابوو، دهيگوت : خوايه لهگهلى ستهمكاران قورتارم بكهى و دالدهم بدهيت.**

## دوعاكردن لهسهر زارو فهرموودهكانى پيَغهمبهردا ﷺ

٤٤- ﴿اللهمَّ آتنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾[1].

(١) البخاري ١٦٣/٧ ، ومسلم ٢٠٧٠/٤ .

واتە: خوایە لە دونیادا چاکەیەکمان پێ ببەخشە، لەدوا ڕۆژیشدا چاکەیەك، لەسزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

٤٥- ﴿اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابَ النَّارِ، وَفِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْفَقْرِ، اللَّهُمَّ انِّي اعُوذُبِكَ من شَرِّ فِتْنَةِ الدَّجَالِ، اغْسِلْ قَلْبِي بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الدَّنَسِ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْمَاثَمِ وَالْمَغْرَمِ﴾ [١].

واتە : خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لە فیتنەو ئاژاوەو بەلاو سزای ئاگری دۆزەخیش، لەفیتنەو ئاژاوەی ناو گۆڕ، لە سزاو ئازاری ناو گۆڕ، لە ئاشوب و ئاژاوەو خراپەی دەوڵەمەندی و هەژاری، خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لە شەڕو شۆڕو خراپەی مەسیحی دەججال، خوایە دل و دەروونم بەلێزماوی بەفرو تەرزە بشۆیتەوە، خوایە دڵ و دەروونم لە هەڵەو تاوان و

(١) البخاري ٧/١٦١ ، ومسلم ٤/٢٠٧٨ .

گوناهەکان پاکژ بکەرە، هەروەك جلی سپی لە کرێژو پیسایی پاك دەکەیتەوە، خوایە نێوانی من و هەڵەو تاوانەکانم هێندە لێکتر دوروو بەرین بکە، هەروەك خۆرهەلاّت و خۆرئاوات لێك دوورخستونەوە، خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لە سستی و تەمبەلی و تاوان و لە قەرزار باری.

٤٦- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْهَرَمِ وَالْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ] [(١)].

واتە : خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لەبێ تاقەتی و دەستەوسان، لەسستی و تەمبەلی، لەترسنۆکی، لەپیرو پەککەوتەیی، لە بەخیلی و ڕژدی، خۆم بەتۆ دەپارێزم لە سزای گۆڕ، لەئاشوب و ئاژاوەی ژیان و مردن.

٤٧- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ جَهْدِ الْبَلاَءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ، وشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ﴾ [(٢)].

---

(١) البخاري ٥٩/٧ ومسلم ٢٠٧٩/٤ .

(٢) البخاري ١٥٥/٧ ومسلم ٢٠٨٠/٤.

**واتە** : خوایە بەتۆ خۆم دەپارێزم لەگرانی و ناڕەحەتی دەردوبەلا، بەردەوامی ناڕەحەتی و نەگبەتی و ناخۆشی و لەحوکم و بڕیاری خراپ و بەد، لەهێزو تواناو گردبوونەوەو گەلەکۆمەی دوژمنان.

٤٨- ﴿اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي، وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَرٍّ﴾ [١].

**واتە** : خوایە دینداری و کاروبارەکانی ئایینیم چاك و پاك بکە، چونکە ئەوە کارو بارە پاك و بێ تاوانەکانمە، ئەو بڕە کات و دونیایەم چاك و باش و بەخێر بکە کە ژیان و بژێوی تیایە، ئەو کات و دوا ڕۆژەم چاك و باش و بەخێر بکە کە گەڕانەوەو حەشرو حسابی منی تیایە.

٤٩- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى، وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ، وَالْغِنَى﴾ [٢]

---

(١) أخرجه مسلم ٤/٢٠٨٧ .

(٢) أخرجه مسلم ٤/٢٠٨٧ .

**واتە** : خوایە داوای هیدایەت و ڕێنمایی و چاکەو خواناسی و داوێن پاکی و پاکیزەیی و دەوڵەمەندیت لێ دەکەم.

٥٠- ﴿اللهمَّ إنِّي اَعُوذُ بكَ من الْعَجْز، وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَم، وَعَذَاب الْقَبْر، اَللَّهُمَّ آت نَفْسي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلاَهَا، اللَّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بكَ منْ علْم لاَ يَنْفَعُ، وَمنْ قَلْب لاَيَخْشَعُ، وَمنَ نَفْس لاتَشْبَعُ ومنْ دَعْوَة لاَ يسْتَجَابُ لَهَا﴾ [1].

**واتە** : خوایە بەتۆ خۆم دەپارێزم لەدەستەوسان و بێ تاقەتی و بێ دەسەڵاتی و لەتەمبەڵی و لە سستی و لەترسنۆکی و لە ڕژدی و لەپیریی و پەککەوتەیی و لەسزای ناوگۆڕ، خوایە تەقواو لەخوا ترسانم پێ ببەخشە، خوایە دڵ و دەروونم چاك بکەوە کەتۆ باشترین پاککەرەوەی، خوایە تۆ باشترین دۆست و پشتیوانی منی، خوایە بەتۆ خۆم دەپارێزم لە فێربوون و زانینی زانست و زانیاریەك کە بێ هودەو بێ کەلکەو هیچ

---

(١) أخرجه مسلم ٢٠٨٨/٤ .

سودێکی نیه، لەدڵێك کە لەتۆ ناترسێ و بۆ تۆ ملکەچ نیە، لە دڵ و دەروون و ئارەزوویەك کەقەت تێرو تەژی نابێ، لەداوایەك کەبێ وەلامەو گیرا نابێ.

٥١- ﴿اللَّهُمَّ اهْدِنِي وَسَدِّدْنِي، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالسَّدَادَ﴾ (١).

**واتە** : خوایە ڕێنماییمان بکەر هەنگاوەکانمان راست و دروستو ئامانجدار بکە. خوایە داوای هیدایەت و ڕێنمایی و هەنگاوی راستو دروستو ئامانجدارت لێ دەکەم.

٥٢- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ﴾ (٢).

**واتە** : خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم، لە نەمان و لاچوونی نازو نیعمەتەکانت و لە گۆڕان و وەرچەرخانی خێرو خۆشی و لێبوردنت، لە دەردو بەڵاو ناخۆشی کتو پڕت، لەهەموو سزاو خەشم و توڕە بوونێکت.

---

(١) أخرجه مسلم ٤/٢٠٩٠ .

(٢) أخرجه مسلم٤/١٠٩٧ .

٥٣- ﴿أللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَـــالَمْ أَعْمَلْ﴾ (١).

**واتە : خوایە گیان خـۆم بـەتۆ دەپـارێزم لـە زەرەرو زیـان و خراپەی ئەوەی کردوومـە و، لەوەی کە نەمکردووە.**

٥٤- ﴿اللهمَّ أَكْثِرْ مَالِي، وَوَلَدِي وَبَارِكْ لِي فِيما أَعْطَيْتَنِي﴾ (٢) ﴿(وَأَطِلْ حَيَاتِي عَلَى طَاعَتِكَ وَأَحسِنْ عَمَلِي) وَاغْفِرْ لِي﴾(٣).

**واتە : خوایە سـەروەت و سـامان و منـاڵم زۆر بکـە، خێـرو**

---

(١) مسلم ٤/٢٠٨٥

(٢) بەڵگە بۆ ئەمە دوعـای پێغەمبـەرە (ص) کـە بـۆ ئەنەسـی کـرد (خوایـە سـەروەتو سـامانو منـداڵی زۆر بکـەی، ئەوەشـی کـەپێت بەخشیوە بەرەکەتداری بکەی) البخاري ٧/١٥٤ ومسلم ٤/١٩٢٨.

(٣) البخاري في الأدب المفرد برقم ٦٥٣ وصحيحة الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيح برقم ٢٢٤١ ، وفي صحيح الأدب المفرد ص٢٤٤ .

واتە: ئەوەی نێو دووکەوانەکـەش فـەرموودەی پێغەمبـەر (ﷺ) دەیـەلێنێ کاتێ پرسیاری لێکـرا: چـاکترین کـەس کێیـە؟ ئـەویش لەوەڵامـدا فـەرموی: (کەسێکە تەمەنی درێژبێ‌و کاروکردەوەی چـاك بـێ) ئیمـامی ترمـزیو ئەحمـەد ریوایـەتیان کـردووەو ئـەلبانیش لەسـەحیحی ترمـزی (٢/٢٧١)دا بەدروسـتی داناوە، هەروەها لەشێخ ئیبن بازیشـم پرسی لەبارەی ئاوادوعا کردنێك کـە ئایـا سوونەتە؟ گوتی: (بەڵێ).

بەرەکەت بخەیتە ئەوەی پێم دەبەخشی، خوایە تەمەن و ژیانم لەسەر چاکەو گوێڕایەڵی خۆت درێژو پڕ خێرو بەرەکەت بکە، کارو کردەوەکانم چاك و باش و ڕەوا بکە، لەگوناه و تاوانەکانم خۆشبە.

٥٥- ﴿لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ، وَرَبُّ الأَرْضِ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾ [١].

واتە : هیچ خوایەکی بەهەق نیە جگە لە (الله) نەبێ، هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی کە (الله)یەو، پەروەردگاری ئەرزو ئاسمانەکان و تەخت و بارەگای بەرزو پیرۆزە.

٥٦- ﴿أَللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو فَلاَ تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَأَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ﴾ [٢].

واتە : خوایە داوای سۆزو بەزەیی لەتۆ دەکەم چاو

---

(١) البخاري ١٥٤/٧ ومسلم ٢٠٩٢/٤ .

(٢) ابو داود ٣٢٤/٤ وأحمد ٤٢/٥ وحسنه الألباني وغيره .

تروكانێكیش ئەم دەیتە دەست نەفسی بەدی خۆم، چونكە خراپەم پێ دەكاو ڕووڕەش و گوناهباری بەردەستی تۆم دەكا، خوایە هەموو كاروبارەكانم بۆ چاك و باش بكە، هیچ خوایەك نیە تەنها تۆ نەبی.

٥٧- ﴿ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنْ الظَّالِمِينَ﴾ [١].

**واتە** : ئەی خوایە هیچ خوایەكی بەهەق و شایستە نیە جگە لەتۆ نەبێ، چاكی و بێگەردی بۆ تۆ، بەڕاستی من لەستەمكارانم بەهۆی ئەو هەڵەو تاوانانەی كردوومە.

٥٨- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ ابْنُ عَبْدِكَ، ابْنُ أَمَتِكَ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أَسأَلُكَ بِكُلِّ إِسمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرآنَ

---

(١) الترمذي ٥/٢٩٥ والحاكم وصححة و وافقه الذهبي ١/٥٠٥ وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٦٨ ولفظة . (دوعاكەی یونس پێغەمبەر كاتێك لەسكی نەهەنگ دابوو ئەوە بوو: ( لااله الا انت سبحانك اني كنت من الظالمين) جا هەر موسلمانێك بۆ هەرشتێك بەمە داوا لەخوای گەورە بكاتو بپارێتەوە ئیلا خوای گەورە وەڵامی داواكەی دەداتەوە.

رَبِيعَ قَلْبِي، وَنُورَ صَدْرِي، وَجَلاَءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي﴾ [١].

**واته** : خوایه من بەندەی تۆم، کوڕی بەندەی تۆم، کوڕی دایکە بەندەی تۆم، خوایە چارەنووس بەدەستە تۆیە، حوکم و فەرمانی تۆ بەسەرمندا جێ بەجێیە بڕیارو دادوەریت لە مندا زۆر دادگەرو بەجێیە، خوایە بەهەموو ناوێك كە ناوی تۆیەو، ناوت پێ لەخۆت ناوەو لە پەرتووكی خۆتدا دادبەزاندووە یا فێری یەكێك لە دروستكراوەكانی خۆت كردووە، یا لەزانست و زانیاری پەنهانی خۆتدا لەلای خۆت هەڵتگرتووەو داوات لێدەكەم كە قورئان بكەیتە شیفاو بەهاری دڵم و ڕوناكی سینەم و دوورخەرەوەو ڕەوێنەرەوەی خەم و پەژارەم و، لابەری خەم و خەفەتەكانم.

٥٩- ﴿اللَّهُمَّ مُصَرِّفَ الْقُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ﴾ [٢].

**واته** : ئەی گۆڕەری دڵەكان، هەمیشە دڵەكانمان بەرەو

---

(١) أحمد ٣٩١/١ ، ٤٥٢ والحاكم ٥٠٩/١ وحسنه الحافظ في تخريج الأذكار ، وصححه الألباني ، انظر، تخريج الكلم الطيب ص ٧٣ .

(٢) مسلم ٢٠٤٥/٤.

گوێڕایەڵی خۆت بگۆڕەو لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەری خۆت ڕاگرو بەردەوامیان بکە.

٦٠- ﴿يَا مُقَلِّبَ الْقُلوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ﴾ [١].

**واتە** : ئەی گۆڕەری دڵ و دەروونەکان دە هەمیشە دڵ و دەروونم لەسەر ئایین و بەرنامەی خۆت ڕاگرو چەسپاو و جێگیر بکە.

٦١- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعفو والْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ [٢].

**واتە** : خوایە لەدونیاو دوا ڕۆژدا، داوای خێرو خۆشی و ساغ

---

(١) الترمذي ٥/٢٣٨ وأحمد ٤/١٨٢ والحاكم ١/٥٢٥ و ٥٢٨ و صححه ووافقه الذهبي ، وانظر، صحيح الجامع ٦/٣٠٩ وصحيح الترمذي ٣/١٧١ نوموسەلەمەدەڵێ: ( ئەمە لەزۆرترینی دوعای پێغەمبەر بوو (ﷺ).

(٢)(داوای ساغی وسەلامەتی و خۆشی دونیاو لەخودا بکەن)، لەریوایەتێکی تردا هاتووە: ( داوای لێخۆشبوونو ساغی و سەلامەتی و خۆشی لەخودا بکەن، چونکە کەسێك لەدوای یەقین شتێکی باشتری لەساغی و سەلامەتی خۆشی پێ نەبەشخراوە).الترمذي ٥/٥٣٤ وغيره ولفظه انظر، صحيح الترمذي ٣/١٨٠ و ٣/١٨٥ و ٣/١٧٠ ولـه شواهد انظر،ها في مسند الإمام أحمد بترتيب أحمد شاكر ١/١٥٦-١٥٧ .

و سەلامەتی و لێبوردنت لێ دەکەم.

٦٢- ﴿اللَّهُمَّ أَحْسِنْ عَاقِبَتَنَا فِي الأُمورِ كُلِّهَا، وَأَجِرْنَا مِنْ خِزْيِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ الآخِرَةِ﴾ [١].

**واتە** : خوایە لەهەموو کارو بارەکاندا، چارەنووسی و دوا ڕۆژمان باش و گونجاو بکە، خوایە لەسەر شۆڕی دونیاو لە سزای دوارۆژمان بپارێزە.

٦٣- ﴿رَبِّ أَعِنِّي وَلاَ تُعِنْ عَلَيَّ، وَانْصُرْنِي وَلاَ تَنْصُرْ عَلَيَّ وَامْكُرْ لِي وَلاَ تَمْكُرْ عَلَيَّ، وَاهْدِنِي وَيَسِّرِ الْهُدَى إِلَيَّ، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ بَغَى عَلَيَّ، رَبِّ اجْعَلْنِي لَكَ شَكَّاراً، لَكَ ذَكَّاراً، لَكَ رَهَّاباً، لَكَ مِطْوَاعاً، إِلَيْكَ مُخْبِتاً أَوَّاهاً مُنِيباً، رَبِّ تَقَبَّلْ تَوْبَتِي، وَاغْسِلْ حَوْبَتِي، وَأَجِبْ دَعْوَتِي، وَثَبِّتْ حُجَّتِي، وَاهْدِ قَلْبِي، وَسَدِّدْ لِسَانِي، وَاسْلُلْ سَخِيمَةَ قَلْبِي﴾ [٢].

---

(١) احمد ٤/١٨١ والطبراني في الكبير ، قال الحافظ الهيثمي في مجمع الزائد ١٠/١٧٨ رجال أحمد وأحدأسانيد الطبراني ثقات .

(٢) ابو داود ٢/٨٣ والترمذي ٥/٥٥٤ وابن ماجه ٢/١٢٥٩ والحاكم وصححة ووافقه الذهبي ١/٥١٩ وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٧٨ وأحمد ١/١٢٧ .

واتــه : خوایــه هاوکــاریم بکــه، هاوکــاری کەســم بەســەر دامەکە، خوایە سەرمخەو کەسم بەسەردا ســەرمەخە، خوایــە نەخشەو پلانە چاکەکانم بۆ دەستەبەر بکە، نەخشەو پلانــی کەسم بەسەردا سەرمەخە، خوایە ڕێنمــاییم بکــەو ڕێنمــایی کردنم بۆ ئاسان بکــە، خوایــە بەســەر ئــەوەدا ســەرمخەو کــە لەســەرم دەرچــووەو ســتەمم لیٚ دەکــا، خوایــە وام لیٚ بکــە هەمیشە زۆر سوپاس و ستایشی بیٚ پایــانی تــۆ بکــەم، زۆر زیکرو باسی تۆ بکەم، زۆر لــەتۆ بترســم، زۆر گوێڕایــەڵ و فەرمانبەری تــۆ بم، بەتەوبــەو پەشــیمانی و چــاك و پــاکی بگەڕێمەوە لای تۆ، خوایە تەوبەو پەشــیمانیم لیٚ گــیرا بکــە، خوایە گوناه و تاوانم بشۆ، خوایــە وەڵامــی تەوبــەو داواکــانم بدەوە، خوایە قسەو بەڵگەکانم بسەپێنە، خوایــە دڵ و دەروونم هیدایەت بدە، خوایە زمانم تەڕو پاراو و نەستەق و بیٚ نەنگ بکە، کون و کەلەبەرەکانی زارو زمانم بنج و بەربەســت بکــە بۆ چاکە گوتن، خوایە ژەنگ و تەنیی و ڕەشایی دڵ و دەروونم پاك بکەوەو لا ببە.

٦٤- ﴿اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ ﷺ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا اسْتَعَاذَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ ﷺ، وَأَنْتَ الْمُسْتَعَانُ، وَعَلَيْكَ الْبَلاَغ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ﴾[1].

**<u>واته</u> : خوایه ئێمه داوای خێرو چاکەیەکت لێ دەکەین، کە موحەممەدی پێغەمبەری تۆ ﷺ داوای لێ کردووی، وەبەتۆ خۆمان لەزەرەرو زیان و خراپەیەك دەپارێزین کە موحەممەدی پێغەمبەرەکەت ﷺ بەتۆ خۆی لێ پاراستووە، خوایە تۆ فریاگوزارو کۆمەککەری، خوایە تەنها ڕاگەیاندن و ئاگادار کردنەوە لەسەرتۆیە، خوایە هیچ هێزو تواناو گۆڕانێك نیە تەنها بە تۆ نەبێ.**

٦٥- ﴿اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي، وَمِنْ شَرِّ بَصَرِي، وَمِنْ شَرِّ لِسَانِي، وَمِنْ شَرِّ قَلْبِي، وَمِنْ شَرِّ مَنِّي﴾[2].

---

(١) الترمذي ٥/٥٣٧ وابن ماجه ٢/١٢٦٤ بمعناه .

(٢) أبو داود٢/٩٢ والترمذي ٥/٥٢٣ والنسائي ٨/٢٧١ وغيرهم وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٦٦ وصحيح النسائي ٣/١١٠٨ .

**واته** : خوایه بەتۆ خۆم دەپارێزم لـە زەرەرو زیـان و خراپـەی بیستن و گوێم، لەهی دیتن و چاوم، لەهی زارو زمانم، لەهی دڵ و دەروونم، لەهی تۆو و بەروبومو وەچەم.

٦٦- ﴿أللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْبَرَصِ، وَالْجُنُونِ، وَالْجُـــذَامِ، وَمِنْ سَيِّءِ الأَسْقَامِ﴾[١].

**واته** : خوایه بەتۆ خـۆم دەپـارێزم لـە بەڵـەکی و شـێتی و گوڕوی و لەسەرجەم نەخۆشیە خراپ و کوشندەکان.

٦٧- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ مُنْكَرَاتِ الأَخْلاَقِ، وَالأَعْمَالِ، وَالأَهْوَاءِ﴾[٢].

**واته** : خوایە بەتۆ خۆم دەپارێزم لە خراپەی ئاکارو کـردەوەو ئارەزووە بەدەکان.

---

(١) ابو داود ٢/٩٣ والنسائي ٨/٢٧١ وأحمد ٣/١٩٢ وانظر، صحيح النسائي ٣/١١١٦ وصحيح الترمذي ٣/١٨٤ .

(٢) الترمذي ٥/٥٧٥ وابن حبان ، والحاكم والطبراني ، وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٨٤ .

٦٨- ﴿اللهمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ كَرِيمٌ تُحِبُّ العَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي﴾ [١].

**واته** : خوایه تۆ خوایه‌کی لێبورده‌و به‌خشنده‌ی، لێبوردنت پێ خۆشه، لێم خۆشبه‌و لێم ببوره.

٦٩- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ، وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ، وَأَنْ تَغْفِرَ لِي، وَتَرْحَمَنِي، وَإِذَا أَرَدْتَ فِتْنَةَ قَوْمٍ فَتَوَفَّنِي غَيْرَ مَفْتُونٍ، وَأَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ، وَحُبَّ عَمَلٍ يُقَرِّبُنِي إِلَى حُبِّكَ﴾ [٢].

**واته** : خوایه داوای ئه‌نجامدانی کاری چاکه‌ت لێ ده‌که‌م، داوای نه‌کردنی کاری خراپت لێ ده‌که‌م، داوای خۆشویستنی گه‌داو هه‌ژارانت لێ ده‌که‌م، خوایه داوات لێ ده‌که‌م لێم خۆشبه، ڕه‌حم پێ بکه، خوایه ئه‌گه‌ر ویستت گه‌له‌که‌م

---

(١) الترمذي ٥/٥٣٤ تحقيق إبراهيم عطوه، مطبعة مصطفى البابي، وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٧٠.

(٢) أخرجه أحمد بلفظة ٥/٢٤٣ والترمذي بنحوه ٥/٣٦٩ والحاكم ١/٥٢١ وحسنه الترمذي وقال: سألت محمد ابن إسماعيل -يعني البخاري- فقال: هذا حديث حسن صحيح لەكۆتایی فەرموودەكەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی فێری ببن و بیخوێننەوە.

دوچاری فیتنەو ئاژاوە بکەی، بەبێ فیتنــەو بەســەلامەتی بم مرێنە، خوایە داوای خۆشویستنی خۆت و ئەو کەســەت لــێ دەکــەم کــەتۆی خــۆش دەوێ ، داوای خۆشویــستنی کــارو کردەوەیەکت لێ دەکەم لەخۆشەویستی تۆم نزیك دەخاتەوە.

٧٠- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّه : عَاجله وَآجلــه مَــا عَلَمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّــه عَاجلــه وَآجله، مَاعَلمْتُ منهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ من خَيْــرِ مَا سَأَلَكَ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ (مَا اسْتَعَاذَ بِــكَ) (مِنْهُ) عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ، وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَــا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَسْأَلُكَ أَنْ تَجْعَلَ كُلَّ قَضَاءٍ قَضَيْتَهُ لِي خَيْراً﴾(١).

**واتە:** خوایە لە خێرو چاکە داوای هەموو شتێکت لێ دەکــەم

---

(١) ابـن ماجـه ١٢٦٤/٢ وأحمـد ١٣٤/٦ ولفـظ الزيـادة الثانيـة لـه ، والحـاكم وصـححة ووافقه الذهبي ٥٢١/١ ولفظ الزيادةو الأولى له ، وانظـر، صـحيح ابن ماجه ٣٢٧/٢ .

له ئێستاو داهاتوودا، درەنــگ و زوو، لــەو خێــرو چــاکانەی کەمن دەیزانم و نایزانم، خوایە خۆم بــەتۆ لــە هــەموو زەرەرو زیان و خراپەیەك دەپارێزم لە ئێــستاو لــە داهــاتوودا، لــەو شتەی دەزانم خراپەو لەوەی نایزانم، خوایە داوای چــاکەیەکت لێ دەکەم بەندەی تۆو پێغەمبەرەکەت داوای لێ کردووی، خۆم بــەتۆ لـــەزەرەرو زیـــان و خراپەیـــەك دەپـــارێزم بەنـــدەو پێغەمبەرەکەت ﷺ خۆی پــێ بــەتۆ لێ پاراســتووە، خوایــە داوای بەهەشتت لێ دەکەم، خوایە داوای کردارو گوفتارێکــت لێ دەکەم پێم نزیك دەکاتەوە لــەخۆت و لــە بەهەشــتەکەت، خوایە خۆم بەتۆ لە ئاگری دۆزەخ و لــەو کــردارو گوفتارانــە دەپارێزم کە لــەئاگری دۆزەخــان نزیــك دەخاتــەوە، داوات لێ دەکــەم هــەموو حــوکم و بڕیارێکــت بەســەرمندا داوە بــۆم بەخێرو چاکە بگێڕی.

٧١- ﴿اللَّهُمَّ احْفَظْنِي بِالإِسْلاَمِ قَائِماً، وَاحْفَظْنِي بالاسلام قاعداً واحفظني بالاسلام راقداً، وَلاَ تُشمت بِي عَدُوّاً وَلاَ حَاســداً، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ كُلِّ خَيْرٍ خَزَائِنُهُ بِيَدِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِــنْ

كُلِّ شَرٍّ خَزَائِنُهُ بِيَدِكَ﴾ [1].

**واته :** خوايه بـه پێـوەو بەدانيـشتنەوەو بەنوسـتويى و لـە هـەموو كـات و بەهـەموو شـێوەيەك بەئيـسلامى پـاك و پيرۆزمان بپارێزە، خوايه وانەكەى هيچ دوژمن و حەسـودێك پێم پێ بكەن و بەسەرمدا زاڵ بن و زەفەرم پێ ببەن، خوايه داواى هـەموو خێـرو چـاكەيەك لـەتۆ دەكـەم خەزێنەكـەى بەدەستۆيە، بەتۆ خۆم لەهـەموو زەرەرو زيـان و خراپەيـەك دەپارێزم ديسان خەزێنەو سەرچاوەكەى لەلاى تۆيه.

٧٢- ﴿اللَّهُمَّ اقْسِمْ لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ مَا تَحولُ بِهِ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعَاصِيكَ، وَمِنْ طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ جَنَّتَكَ، وَمِنَ الْيَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَيْنَا مَصَائِبَ الدُّنْيَا، أللَّهُمَّ مَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا، وَأَبْصَارِنَا، وَقُوَّاتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا، وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا، وَاجْعَلْ ثَأرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا، وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا، وَلاَ تَجْعَلْ مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا، وَلاَ تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا، وَلاَ مَبْلَغَ عِلْمِنَا، وَلاَ تُسَلِّطْ عَلَيْنَا

---

(١) الحاكم ٥٢٥/١ وصححه ووافقه الذهبي، وانظر، مجمع الجامع ٣٩٨/٢ والأحاديث الصحيحة ٥٤/٤ برقم ١٥٤٠.

مَنْ لاَ يَرْحَمُنَا﴾ (١).

**واته** : خوایه لەفەزل و بەخشش و ترسی خۆت بەشێکمان پێ بدە کە لە نێوان ئێمەو تاوانەکانمان بەرانبەر تۆ ببێتە پەردەو هێزو گۆڕانکاریەك وامان لێ بکا هەرگیز گوناه و تاوان بەرانبەر تۆ نەکەین، بەشێکمان لە گوێڕایەڵی و فەرمانبەریکردنی خۆت پێ بدە پێی بە بەهەشت بگەین، بەشێکمان لە بیروباوەڕو دڵنیایی وە پێ بدە کە دەرد و بەلاو ناخۆشیەکانی دونیامان پێ لەسەر سوك و ئاسان دەبێ، خوایە بەهۆی گوێکانمان و، بەهۆی چاوەکانمان و، بەهۆی ئەو تواناو هێزانەمان دەوڵەمەندو بەهرەمەندمان بکە، وە هەر یەکێکیش لەمانە بکە میراتگر لە ئێمەدا کە هەمیشە لەنێو ڕۆڵەو وەچەکانم بمێنن، خوایە تۆڵەمان بۆ لەو کەسەبکەیتەوە کە ستەمی لە ئێمە کردووە، و سەرمانبخە بەسەر ئەو کەسەی کە دوژمنایەتیمان دەکا و ناحەزمانە،

---

(١) الترمذي ٥/٥٢٨ والحاكم ١/٥٢٨ وصححه ووافقه الذهبي، وابن السني برقم ٤٤٦ وانظر، صحيح الترمذي ٣/١٦٨ وصحيح الجامع ١/٤٠٠ .

خوایه با دەردو بەلاکانمان لەدینماندا نەبن، بەدین تاقیمان مەکەوە، مەبادە خۆدەبەر نەگرین و دینمان لەدەست بدەین، خوایه وانەکەی کە دونیا بازی ببێتە تاکە هیواو ئاوات و خەممان، یا ببێتە جێی برە زانستێکی بێ سوودمان، هەرگیز کەسێکمان بەسەردا زاڵ نەکەی ستەم کارو خوا نەناسەو رەحمان پێ ناکات.

٧٣- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ الْقَبْرِ﴾ (١).

واته : خوایه بەتۆ خۆم دەپارێزم لە ترسان و لە رژدی و لەپیرو پەککەوتەیی و لەوەی بمگێڕیەوە سەر خراپترین تەمەن، خۆم دەپارێزم لەفیتنەو ئاژاوەی دونیاو سزای ناو گۆڕ.

٧٤- ﴿اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي، وَجَهْلِي، وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي،

---

(١) البخاري مع الفتح ١١/١٨١ .

وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، اللهمَّ اغْفِرْ لِي هَزْلِي وَجِدِّي، وَخَطَئِي وَعَمْدِي، وَكُلُّ ذلِكَ عِنْدِي﴾[1].

**واتە : خوایە لە هەڵەو تاوانەکان و نەزانی و لە زێدە ڕۆیی کردنم لەکارەکانمدا خۆشبە، خوایە لەوەم خۆشبە کە تۆ زیاتر لەمن پێی ئاگادارتری، خوایە لەشتە گاڵتە و ڕاستەکانم خۆشبە، لەوانەی کە بە گاڵتە یا بەجدی کردونم، خوایە لەهەڵەو بەئانقەستەکانم خۆش بەو، هەموو ئەوانش لەلایەن خۆمەوەن.**

٧٥- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً، وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدَكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾[2].

**واتە : خوایە من ستەمێکی زۆرم لەخۆم کردووە، کە سیش لە گوناه و تاوانەکان خۆش نابێ و توانای ئەوەی نیە، لێم خۆشبە بە لێخۆشبونێك کە لەلای خۆتە، دە ڕەحم پێ بکە،**

(١) البخاري مع الفتح ١١/١٩٦ برقم ٦٣٩٨ .

(٢) البخاري ١/٣٠٢ ومسلم ٤/٢٠٧٨ .

**چونكە تۆ زۆر لێبوردەو بەبەزەیی.**

٧٦- ﴿أَللّٰهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِي، أَنْتَ الْحَيُّ الَّذِي لاَ يَمُوتُ، وَالْجِنُّ وَالإِنْسُ يَمُوتُونَ﴾ [١].

**واتە : خوایە بۆ تۆ موسڵمان بووم و باوەڕم بەتۆ هێناوەو پشت بەتۆ دەبەستم، خوایە پەشیمان بوومەوە، خوایە بەتۆ دوژمنایەتی دوژمنانت دەكەم، خوایە بەهێزو دەسەلاتی تۆ خۆم دەپارێزم جگە لە تۆ هیچ خوایەك نیە گومڕاو سەرگەردانم بكا، خوایە تۆ هەمیشە زیندووی و هەرگیز نامری، وەلێ ئینسان و جن دەمرن.**

٧٧- ﴿أَللّٰهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مُوجِبَاتِ رَحْمَتِكَ، وَعَزَائِمَ مَغْفِرَتِكَ، وَالسَّلاَمَةَ مِنْ كُلِّ إِثْمٍ، وَالْغَنِيمَةَ مِنْ كُلِّ بِرٍّ، وَالْفَوْزَ بِالْجَنَّةِ،

---

(١) البخاري ١٦٧/٧ ومسلم ٢٠٨٦/٤ .

وَالنَّجَاةَ مِنَ النَّارِ﴾ (١).

**واته** : خوایه ئێمه داوای پێداویستیه‌كانی ڕه‌حمه‌تی خۆتت لیٚ ده‌كه‌ین، ئه‌و شتانه‌ی كه‌ ڕه‌حمه‌تی تۆ به‌رانبه‌ر ئێمه‌ واجب ده‌كه‌ن، داوای وه‌سیته‌كانی لێخۆشبوونت لیٚ ده‌كه‌ین، داوای ده‌وڵه‌مه‌ندیت لیٚ ده‌كه‌ین دوای هه‌موو به‌خشین و چاكه‌ كردنێك، داوای به‌هه‌شتت لیٚ ده‌كه‌ین، داوای ڕزگار بوونمان له‌ دۆزه‌خت لیٚ ده‌كه‌ین.

٧٨- ﴿اللَّهُمَّ اجْعَلْ أَوْسَعَ رِزْقِكَ عَلَيَّ عِنْدَ كِبَرِ سِنِّي، وَانْقِطَاعِ عُمُرِي﴾ (٢).

**واته** : خوایه‌ ڕزق و ڕۆزی و بژێویم له‌سه‌ر زۆر فراوان و ئاسان بكه‌ له‌كاتی ته‌مه‌ن زۆری وپیریم.

٧٩- ﴿اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي وَوَسِّعْ لِي فِي دَارِي، وَبَارِكْ لِي فِي

---

(١) الحاكم ١/٥٢٥ وصححه ووافقه الذهبي ، وانظر، الأذكار للنووي ص ٣٤٠ فقد حسنه المحقق عبدالقادر الأرناؤوط.

(٢) الحاكم ١/٥٤٢ وانظر، صحيح الجامع ١/٣٩٦ والأحاديث الصححة رقم ١٥٣٩ .

رِزْقي﴾ (1).

**واته** : خوایه له گوناهم خۆشبه، خوایه ماڵ و خانەم فراوان بکه بۆم، خوایه پیت و بەرەکەت بخه رزق و ڕۆزی و بژێوم.

٨٠- ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ وَرَحْمَتِكَ، فَإِنَّهُ لاَ يَمْلِكُهَا إِلاَّ أَنْتَ﴾ (2).

**واته** : خوایه داوای فەزڵ و بەخشش و ڕەحمەتی خۆتت لێ دەکەم، چونکه کەس ئەوەی نیه تەنها تۆ نەبی.

٨١- ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ التَّرَدِّي، وَالْهَدْمِ، وَالْغَرَقِ، وَالْحَرَقِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّيْطَانُ عِنْدَ الْمَوْتِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ فِي سَبِيلِكَ مُدْبِراً، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ لَدِيغاً﴾(3).

**واته** : خوایه بەتۆ خۆم دەپارێزم لە هەڵدرێران و

---

(1) احمد ٦٣/٤ و ٣٧٥/٥ وانظر، صحيح الجامع ٢٩٩/١.

(2) أخرجه الطبراني ، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد ١٥٩/١٠ : رجاله رجال الصحيح غير محمد بن زياد وهو ثقة وانظر، صحيح جامع ٤٠٤/١ .

(3) أخرجه النسائي وأبو داود ٩٢/٢ وانظر، صحيح النسائي ١١٢٣/٣ .

**هەڵگەڕانەوەو خراپ بوونم، خۆم دەپارێزم لە وێرانبوون و ژێر کەوتن، لە خنکان، لەسووتان، وەخۆم دەپارێزم، لەوەی شەیتانی بەد لەکاتی مردن دەستم لێ بداو خۆم بەسەردا بێنێ و بەسەرمدا زاڵ بێ، خۆم دەپارێزم لەوەی کە مارانگازو بەپێوە دراوی بمرم، مار یا دووپشك پێم وەبدات.**

٨٢- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ، فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ، فَإِنَّهَا بِئْسَتِ، الْبِطَانَةُ﴾.

**واتە : خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لەبرسیەتی، چونکە برسیەتی خراپترین کەمو کوڕییە، وەخۆم بەتۆ لە ناپاکی دەپارێزم، چونکە ناپاکی خراپترین کاری نهێنییە.**

٨٣- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ، وَالْكَسَلِ، والْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ، وَالْقَسْوَةِ، وَالْغَفْلَةِ، وَالْعَلْيَةِ، وَالذِّلَّةِ، وَالْمَسْكَنَةِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْفَقْرِ، وَالْكُفْرِ، وَالرِّيَاءِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الصَّمَمِ، وَالبكَمِ، وَالْجُنُونِ، وَالْجُذَامِ، وَالْبَرَصِ، وَسَيِّءِ الأَسْقَامِ﴾[1].

---

(١) الحاكم والبيهقي ، وانظر، صحيح الجامع ١/٤٠٦ وإرواء الغليل برقم ٨٥٢.

**واتە** : خوایە بەتۆ خۆم دەپارێزم لە بێهێزی و بێ دەسـەلاتی و لەتەمبـەلی و لەترسـنۆکی و لـە ڕژدی و لـە پـیری و لەدڵڕەقی و لە بـێ ئاگـایی و لەهـەژاری و نـەداریی و لـە زەلیلی و زەبوونی و لەنەبوونی و گەدایی و لە بـێ بـاوەڕی و لـە دەرچـوون و گوناهبـاری و لـە بەدبـەختی و پـشێوی و نەگبەتی، لە دوو ڕوویی و بێ ئابڕۆیی و بێ سومعەیی و لە ڕوپامایی، خۆم دەپارێزم لە کەڕو لاڵی و شێتی و گڕوێـی و لەبەلەکی و لەسەرجەم دەردو بەلاو نەخۆشیە بەدو خـراپ و کوشندەکان.

٨٥- ﴿أَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ جَارِ السُّوءِ فِي دَارِ الْمُقَامَةِ، فَإِنَّ جَارَ الْبَادِيَةِ يَتَحَوَّلُ﴾ [١].

**واتە** : خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لـەدەرو دراوسـێی خـراپ و بەد لە نیشینگەم، لەو شوێنەی کە هەمیشە تێیدا دادەنیشم و شـوێنی هەمیـشەمە، نـەك شـوێنی گـەڕان و کۆچـەری،

---

(١) الحاكم ٥٣٢/١ وصححه ووافقه الذهبي ، وأخرجه النسائي ٢٧٤/٨ وانظر، صحيح الجامع ٤٠٨/١ وصحيح النسائي ١١١٨/٣ .

چونکە دراوسێی دەشت و دەرو کۆچەری دەگۆڕێ و نامێنێ.

٨٦- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ وَمِنْ دُعَاءٍ لاَ يُسْمَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَؤُلاَءِ الأَرْبَعِ﴾ (١).

**واتە** : خوایە بەتۆ خۆم دەپارێزم لە دڵێك ملکەچ نابێ و لەتۆ ناترسێ، لەداوایەك نابیسترێ و گوێی لێ ناگیرێ، لەنەفس، ئارەزوویێك تێر نابێ، لەزانستێك کەلکی نابێ، خوایە خۆم لەو چوار شتانە دەپارێزم.

٨٧- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ يَوْمِ السُّوءِ، وَمِنْ لَيْلَةِ السُّوءِ، وَمِنْ سَاعَةِ السُّوءِ، وَمِنْ صَاحِبِ السُّوءِ، وَمِنْ جَارِ السُّوءِ فِي دَارِ الْمُقَامَةِ﴾ (٢).

**واتە** : خوایە بەتۆ خۆم دەپارێزم لە ڕۆژی خراپ، لە شەوی

---

(١) الترمذي ٥/٥١٩ وأبو داود ٢/٩٢ وانظر، صحيح الجامع ١٠/٤١٠ وصحيح النسائي ٣/١١١٣ .

(٢) أخرجه الطبراني وقال الهيثمي في مجمع الزوائد ١٠/١٤٤ : ورجاله رجال الصحيح ، وانظر، صحيح الجامع ١/٤١١ .

خراپ، لەکاتی خراپ، لەهاوڕێی خـراپ، لـەدەرو دراوسـێی بەدر خراپ لە نشینگەم، ئەو شـوێنەی کەهەمیـشە تێیـدا دادەنیشم.

٨٨- ﴿اللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَأَسْتَجِيرُ بِكَ مِنْ النَّارِ﴾ (ثَلاَثَ مَرَّاتٍ) [١].

واتە : خوایە گیان داوای بەهەشتت لێ دەکەم، وەبـەتۆ خـۆم لەئاگری دۆزەخ دەپارێزم. (سێ جار دەگوترێت).

٨٩- ﴿اللّٰهُمَّ فقهني فِي الدِّينِ﴾ [٢].

واتە : خوایە لە ئاینم شارەزاو زانا بکە.

٩٠- ﴿اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ

---

(١) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (هەرکەسێك داوای بەهەشت لـەخودا بکـات، بەهەشت دەڵـێ خودایـە بیبـە بەهەشـت، هەرکەسـێك داوای لـەخودا کـرد لەدۆزەخ بیپارێزێـت دۆزەخ دەڵـێ ، خودایـە لـەدۆزەخ دووری بخـە) الترمـذي ٧٠٠/٤ وابـن ماجـه ١٤٥٣ والنـسـائي وانظـر، صـحيح الترمـذي ٣١٩/٢ وصحيح النسائي ١١٢١/٣ .

(٢) يدل عليه رواية البخاري ومسلم في دعاء النبي ﷺ لا بن عباس ، انظـر، البخاري مع الفتح ٤٤/١ ومسـلم ١٧٩٧/٤.

لِمَا لاَ أَعْلَمُ﴾[1].

واته : خوایه من بەتۆ خۆم لەوە دەپارێزم شەریکت بۆ بڕیار بدەم بشزانم، داوای لێبوردن و لێخۆشبوونت لێدەکەم لەوەی دەیکەم و ناشزانم ئاخۆ گوناه و شیرکه یان نا.

٩١- ﴿اَللَّهُمَّ انْفَعْنِي بِمَا عَلَّمْتَنِي، وَعَلِّمْنِي مَا يَنْفَعُنِي، وَزِدْنِي عِلْماً﴾ [2].

**واته** : خوایه سوودم پێ بگەیەنە بەهۆی ئەوەی فێرت کردم، ئەوەم فێر بکە کەڵکم پێ دەگەیەنێ، هەمیشە زانست و زانیاریم فرەو زیاد بکە.

٩٢- ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْماً نَافِعاً، وَرِزْقاً طَيِّباً، وَعَمَلاً مُتَقَبَّلاً﴾ [3].

**واته** : خوایه داوای زانستێکی بەسوود و، ڕزق و ڕۆزیەکی پاك و حەلاڵ و فراوان و، کردەوەیەکی وەرگیراوت لێ دەکەم.

---

(١) رواه أحمد ٤٠٣/٤ وغيره وانظر، صحيح الترغيب والترهيب للألباني ١٩/١.

(٢) أخرجه ابن ماجه ٩٢/١ وانظر، صحيح ابن ماجه ٤٧/١.

(٣) أخرجه ابن ماجه ٢٩٨/١ وانظر، صحيح ابن ماجه ١٥٢/١ .

٩٣- ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ يَا أَللهُ بِأَنَّكَ الْوَاحِدُ الأَحَدُ، الصَّمَدُ الَّذي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ، أَنْ تَغْفِرَ لِي ذُنُوبِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾[1].

**واتە : خوایە مـن داوا لـەتۆ دەكـەم تـۆ خوایـەكی تـاك و تەنیای، جێی نیازو مەبەستی هەموو دروستكراوەكانی، ئـەو خوایە لە كەس نەبووە، كەسیشی لێ نەبووە، بـێ شـەریك و هاوتایەو كەس وەكو ئەو نیە، خوایـە لـەگوناه و تاوانـەكانم خۆشبە، چونكە هەر تۆ لێبوردەو بەبەزەیی.**

٩٤- ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدُ، لاَ إِلَـهَ إِلاَّ أَنْتَ (وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ) الْمَنَّان (يَا) بَدِيعَ السَّمَوات وَالأَرْضِ، يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ، يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ، إِنِّي أَسْأَلُكَ (الْجَنَّةَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ) ﴾[2].

**واتە : خوایە داوا لەتۆ دەكەم، سوپاس و ستایش هـەر بـۆ**

---

(١) النسائي بلفظه ٣/٥٢ وأحمد ٤/٣٣٨ وانظر، صحيح النسائي ١/٢٧٩ .

(٢) أبو داود ٢/٨٠ وابن ماجه ٢/١٢٦٨ والنسائي ٣/٥٢ والترمذي ٥/٥٥٠ وانظر، صحيح النسائي ١/٢٧٩ .

تۆیە، هیچ خوایەك نیە بەتەنها تـۆ نـەبی، هـیچ شـەریك و هاوەلێكت نیە، تۆ نازو منەت لەسەر بوونەوەر دەكەی، ئـەی دروست كەرو داهێنەری ئەرزو ئاسمانەكان، ئەی خاوەن شكۆو ڕێزو پلـەو پایـە، ئـەی خـوای هەمیـشە زینـدوو و ڕاگـری بوونەوەر، داوای بەهەشتت لیّ دەكەم، بـەتۆ خـۆم لـەئاگری دۆزەخ دەپارێزم.

٩٥- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ أَنْتَ، الأَحَدُ، الصَّمَدُ، الَّذي لَمْ يَلِدْ، وَلَمْ يَكُـنْ لَـهُ كُفُـواً أَحَدٌ﴾[1].

**واتە** : خوایە داوا لەتۆ دەكـەم بـەجۆریّ گـەواهی دەدەم تـۆ خودای تاك و تەنیای و هەرتۆ خۆت خودای بوونەوەری، خوای تاك وتەنیای، جێی نیازو مەبەستی هەموو دروستكراوەكانی بوونەوەری، ئەو خوایەی كـە لەكـەس نـەبووە، كەسیـشی لیّ نەبووە، هیچ شەریك و هـاوەلێكی نیـەو، كـەس وەكـو ئـەو

(١) ابو داود ٢/٧٩ و الترمذي ٥/٥١٥ وابن ماجه ٢/١٢٦٧ و أحمد ٥/٣٦٠ وانظر، صحيح سنن الترمذي ٣/١٦٣ .

خوايه نيه.

٩٦- ﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي، وَتُبْ عَلَيَّ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الْغَفُورُ﴾ (١).

**واته** : خوايه ليّم خۆشبەو تەوبەو پەشيمانيم لێ قەبوول بكە چونكە تۆ ليّبووردەو تۆبە وەرگرى.

٩٧- ﴿اللَّهُمَّ بِعِلْمِكَ، وَقُدْرَتِكَ عَلَى الْخَلْقِ، أَحْيِنِي مَا عَلِمْتَ الْحَيَاةَ خَيْراً لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا عَلِمْتَ الْوَفَاةَ خَيْراً لِي، اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَشْيَتَكَ فِي الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، وَأَسْأَلُكَ كَلِمَةَ الْحَقِّ فِي الرِّضَا وَالْغَضَبِ، وَأَسْأَلُكَ الْقَصْدَ فِي الْغِنَى وَالْفَقْرِ، وَأَسْأَلُكَ نَعِيماً لاَ يَنْفَدُ، وأسألك قرة عين، لاينقطع، واسألك الرضاء بعد القضاء، واسألك برد العيش بعد الموت، وَأَسْأَلُكَ لَذَّةَ النَّظَرِ إِلَى وَجْهِكَ، وَالشَّوْقَ إِلَى لِقَائِكَ، فِي غَيْرِ ضَرَّاءَ مُضِرَّةٍ، وَلاَ فِتْنَةٍ مُضِلَّةٍ، اللهمَّ زَيِّنَّا بِزِينَةِ الإِيمَانِ، وَاجْعَلْنَا هُدَاةً

---

(١) ابو داود والترمذي واللفظ له ، والنسائي وابن ماجه ١٣٥٣/٢ وانظر، صحيح ابن ماجه ٣٢١/٢ وصحيح الترمذي ١٥٣/٣ .

مُهْتَدِينَ﴾[1].

**واته** : خوایە بەزانستی پەنهان و بەتوانای سەر بوونەوەرت، بمژێنە لە ژیاندا تا ئەو کاتەی کەتۆ دەزانی ژین بۆ من خێری تیایە، بم مرێنە ئەگەر دەزانی مردن لە ژیان زیاتر خێری تیایە بۆ من، خوایە داوای لێترسانت لێدەکەم بەئاشکراو بەنهێنی، وە داوای ووشەو قسەی هەق و ڕاستت لێ دەکەم لەکاتی ڕازی بوون و توڕەبوونم هیچی خراپ و نا شەرعی نەڵێم، داوای مامناوەندیت لێ دەکەم لەکاتی هەژاری و دەوڵەمەندیدا تووشی ناشوکری نەبم، داوای نازو نیعمەتێکت لێ دەکەم کە هەرگیز کۆتایی نابێت و لەناو نەچێ، وە داوای چاو روونییەکت لێ دەکەم هەرگیز کۆتایی نایێ نێتەو نەپچڕێ ، داوای ڕازی بوونت لێ دەکەم لەسەر ئەو بڕیارەی بەسەرمدا دەدەی، داوای ژیانێکی فێنك و خۆش گوزەرت لێ دەکەم، دوای مردنم لە گۆڕو دوا ڕۆژدا، داوای تام

---

(١) النسائي ٣/٥٤ ، ٥٥ وأحمد ٤/٣٦٤ وإسناده جيد ، وانظر، : صحيح النسائي ١/٢٨٠ و ١/٢٨١ .

و چێژ لێوەرگرتنت لێ دەكـەم لـە ڕوانینـت، داوای شـەوق و شەیدابیت لێ دەكەم كاتێك كـە بـەتۆ دەگـەم بـەبێ ئـەوەی زەرەرو زیانم پێ بگا، دووچـاری هـیچ ئاشـوب و ئاژاوەیـەكی گومڕا كەر بم، خوایە بـەجوانی بـیرو بـاوەڕی ئیـسلامەتی و خواپەرستی جوانمان بكـەی و بمـان ڕازێنێتـەوە ، بمانكەیتـە ڕابەرو پێشەنگی ڕێنما كراوەكانی ئیسلام.

٩٨- ﴿أللَّهُمَّ ارْزُقْنِي حُبَّكَ، وَحُبَّ مَنْ يَنْفَعُني حُبُّهُ عِنْدَكَ، اللهمَّ مَا رَزَقْتَني مِمَّا أُحبُّ فَاجْعَلْهُ قُوَّةً لي فِيما تُحبُّ، اللـــهمَّ مَـــا زَوَيْتَ عَنِّي مِمَّا أُحبُّ فَاجْعَلْهُ فَرَاغاً لِي فِيمَا تُحبُّ﴾ [١].

واتە : خوایە خۆشەویستی خۆتم پێ ببەخشە، خۆشەویستی ئەو كەسەشم پـێ ببەخـشە خـۆش ویـستنەكەی لـەلای تـۆ سوودم پێ دەگێنێ، خوایە ئەوەی پێم دەبەخشی لـەوەی پـێم خۆشە بۆم بكە هێزێك لەوەی تۆ پێت خۆشە، خوایـە ئـەوەی لێم دەبەی و لێم دەستێنیەوە لەوەی پێم خۆشەو خۆشـم دەوێ

(١) اخرجه الترمذي ٥/٥٢٣ وحسنه ، وقال الشيخ عبدالقادر الأرناؤوط : وهو كما قال : انظر، تحقيقه لجامع الأصول ٤/٣٤١ .

بۆم بکە سەبرو بۆشاییەك تۆ پێت خۆشەو پێی ڕازیت.

٩٩- ﴿أَللَّهُمَّ طَهِّرْنِي مِنَ الذُّنُوبَ وَالْخَطَايَا، اللهمَّ نَقِّنِي مِنْهَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللهمَّ طَهِّرْنِي بِالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ وَالْمَاءِ الْبَارِدِ﴾ [١].

**واتە** : خوایە لە گوناه و تاوان و هەڵەکانم پاك بکەوە، خوایە لەوانەم پاکژ بکەوە هەروەك جلی سپی لە چڵك و پیسی پاکژ دەبێتەوە، خوایە بەبەفرو تەرزەو ئاوی ساردو سازگار پاکم بکەوە.

١٠٠- ﴿أَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُبِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَالْجُبْنِ، وَسُوءِ الْعُمُرِ، وَفِتْنَةِ الصَّدْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ﴾ [٢].

**واتە** : خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لە ڕژدی و ترسنۆکی و

---

(١) النسائي ١/١٩٨ و ١٩٩ والترمذي ٥/٥١٥ وانظر، صحيح سنن النسائي ١/٨٦ .

(٢) النسائي ٨/٢٥٥ ولفظة (پێغەمبەر (ﷺ) داوای لەخوای گەورە دەکرد لەپێنج شتانی بپارێزێ: لەڕژدی و ترسنۆکیو تەمەن خراپی فیتنەو نەخۆشی دڵو دەروونو لەسزای ناوگۆڕ).

**تەمەن خراپی و فیتنەو نەخۆشی دڵ و دەروون و لەسزای ناو گۆڕ.**

١٠١- ﴿اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرَائِيلَ، وَمِكَائِيلَ، وَرَبَّ إِسْرَافِيلَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ حَرِّ النَّارِ وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ﴾ [1].

**واتە : ئەی خوای پەروەردگاری فریشتە جبریل و میکایل و ئیسرافیل، خۆم بەتۆ دەپارێزم لە گەرماو هەڵماوی دۆزەخ و لەسزای ناو گۆڕ.**

١٠٢- ﴿اللَّهُمَّ أَلْهِمْنِي رُشْدِي، وَأَعِذْنِي مِنْ شَرِّ نَفْسِي﴾ [2].

**واتە : خوایە پێگەیشتن و سەر ڕاستیم پێ ببەخشە، وە لەزەرەرو زیان و خراپەی دڵ و دەروون و نەفسی بەدی خۆمم بپارێزە.**

١٠٣- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْماً نَافِعاً، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لا

---

(١) اخرجه النسائي ٢٧٨/٨ وانظر، صحيح النسائي ١١٢١/٣ .

(٢) رواه أحمد ٤٤٤/٤ والترمذي واللفظ له ٥١٩/٥ واسناده عند أحمد جيد .

يَنفَعُ﴾ (١).

**واتە** : خوایە داوای زانستێکی زۆر بە کەلك و پڕ سوودت لێ دەکەم، خۆم بەتۆ دەپارێزم لە زانستێك کە هیچ سوودی نیەو بێ کەلکە.

١٠٤- ﴿اللَّهُمَّ رَبَّ السَّموَاتِ (السَّبْعَ) وَرَبَّ الأَرْضِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْفُرْقَانِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللهمَّ أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ﴾ (٢).

**واتە** : ئەی خوای پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و زەوی،

---

(١) داوای زانستێکی بەکەڵك و بەسوود لەخوای گەورە بکەن و خۆتان بەخوای گەورە بپارێزن لە زانستێکی بێ کەڵك و بێ سوود، ابن ماجه ١٢٦٣/٢، وانظر، صحيح سنن ابن ماجه ٣٢٧/٢ ولفظه.

(٢) اخرجه مسلم ٢٠٨٤/٤ أبي هريرة (رضى الله عنه) .

**پـــەروەردگاری تـــەخت و بارەگـــای گـــەورەو گوشـــاد، پـــەروەردگارمان پـــەروەردگاری هـــەموو شـتێکی بوونـــەوەر، دروستکەری دەنك و ناوك و ئەوەی کە تیایـەتی، دابەزێـەری تەوارت و ئینجل و فورقان (لێك جیاکەرەوەی هەق و باطل)، خوایە خۆم دەپارێزم بەتۆ لەهەموو خراپەیەکی ژیان، خوایـە چارەنووسی من بەدەست تۆیەو لەلای تۆیە، خوایە هـەر تـۆ یەکەمی و هیچ شتێك پێش تۆ لە بوون نەبووەو نیە، خوایـە تۆ کۆتا ودوماهی و، هیچ شتێك لەپاشە تـۆ نیـە و نـاژی و نامێنێ، تۆ دیارو ئاشکرای و لەسەر تۆو لەو دیوی تۆ هـیچ شتێکی تر نیە، خوایە تۆ خوایەکی پەنهانی و نادیاری وەکو خودی خۆت، جگە لەتۆو لە خوارە تۆ هـیچ خوایـەکی تـری بەهەق و ڕەوا نیە، خوایـە قـەرزمان لـەجیاتی جـێ بـەجێ بکەوەو، دەوڵەمەندمان بکە.**

١٠٥- ﴿اللَّهُمَّ أَلِّفْ بَيْنَ قُلُوبِنَا، وَأَصْلِحْ ذَاتَ بَيْنِنَا، وَاهْدِنَا سُبُلَ السَّلَامِ، وَنَجِّنَا مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ، وَجَنِّبْنَا الْفَوَاحِشَ مَــا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ، وَبَارِكْ لَنَا فِي أَسْمَاعِنَا، وَأَبْصَارِنَا، وَقُلُوبِنَا،

وَأَزْوَاجنَا، وَذُرِّيَّاتنَا شَاكِرِينَ لِنعَمِكَ مُثْنِينَ بِهَا عَلَيْكَ قَابِلِينَ لَهَا وَأَتْمِمْهَا عَلَيْنَا﴾ (١).

**واته** : خوایە دڵەکانمان پێکەوە کۆبکەوە و گریێ بدە، ئەوەی لەنێوانمانە بۆمان سازو چاك بکە، خوایە ڕاستە ڕێی چاك و ئاشتیمان بۆ دیار بکە، خوایە لە تاریکیــەکانمان ڕزگاربکــە بەرەو ڕوناکایی، خوایە لە خراپەو بەدڕەوشــتیەکمان بپــارێزە کە دیارو ئاشکرایەو لەوەی نادیارو شاراوەو نەزانراوە، خوایــە بەرەکەت بخە گویێ و بیستنەکانمان و، بیــنین و چــاوەکانمان و، دڵەکانمانو هاوسەرەکانمان، خوایــە تەوبــەو پەشــیمانیمان لێ قەبوول بکە، چونکە تۆ تەوبە وەرگــرو بەخــشندەو بــەڕەحمی، خوایە بمانکە ســوپاس گــوزاری نــازو نیعمەتــەکانی خــۆت، وامان لێ بکە هەمیشە سوپاس و ستایشی تۆ بکەین لەسەر ئەو نازو نیعمەتانەی بە ئێمەت داوە، خوایە هەمیشە بمانکــە شایستەی نــازو نیعمەتــەکانی خــۆت و پێمــان ڕەوا ببینــەو

---

(١) اخرجه الحاكم وقال : صحيح على شرط مسلم ، ووافقه الذهبي ١/٢٦٥ .

**لێمان مەگرەوە، خوایە هەمیشە نازو نیعمەتەکانی خۆتمان بۆ زیاد بکە.**

١٠٦- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ الْمَسْأَلَةِ، وَخَيْرَ الدُّعَاءِ، وَخَيْرَ النَّجَاحِ، وَخَيْرَ الْعَمَلِ، وَخَيْرَ الثَّوابِ، وَخَيْرَ الْحَيَاةِ، وَخَيْرَ الْمَمَاتِ، وَثَبِّتْنِي وَثَقِّلْ مَوَازِينِي، وَحَقِّقْ إِيْمَانِي، وَارْفَعْ دَرَجَاتِي، وَتَقَبَّلْ صَلاَتِي، وَاغْفِرْ خَطِئَتِي، وَأَسْأَلُكَ الدَّرَجَاتِ الْعُلَى مِنْ الْجَنَّةِ، اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فَوَاتِحَ الْخَيْرَ، وَخَوَاتِمَهُ، وَجَوامِعَهُ، وَأَوَلَهُ، وَظَاهِرَهُ، وَبَاطِنَهُ، وَالدَّرَجَاتِ الْعُلَى مِنَ الْجَنَّةِ آمينْ.

اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا آتِي، وَخَيْرَ مَا أَفْعَلُ، وَخَيْرَ مَا أَعْمَلُ، وَخَيْرَ مَا بَطَنَ، وَخَيْرَ مَا ظَهَرَ، وَالدَّرَجَاتِ الْعُلَى مِنَ الْجَنَّةِ آمينْ. اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ أَنْ تَرْفَعَ ذِكْرِي، وَتَضَعَ وِزْرِي، وَتُصْلِحَ أَمْرِي، وَتُطَهِّرَ قَلْبِي وتحصن فرجي وتنور قلبي، وَتَغْفِرَ لِي ذَنْبِي، وَأَسْأَلُكَ الدَّرَجَاتِ الْعُلَى مِنَ الْجَنَّةِ آمينْ اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ أَنْ تُبَارِكَ فِي نَفْسِي، وَفِي سَمْعِي، وَفِي بَصَرِي، وَفِي رُوحِي، وَفِي خُلُقِي وخَلقي وفِي اهلي وفِي مماتي، وَفِي مَحياي،

وَفِي عَمَلِي فَتَقَبَّلْ حَسَنَاتِي، وَأَسْأَلُكَ الدَّرَجَاتِ الْعُلَى مِنَ الْجَنَّةِ آمِينْ﴾ [1].

**واتە** : خوایە داوای باشترین شتت لێ دەکەم، داوای باشترین دوعاو، باشترین سەرکەوتن و، باشترین کارو کردەوە، باشترین خێرو پاداشت و، باشترین ژیان و مردنت لێ دەکەم، خوایە جێگیرو خۆڕاگرم بکە، خوایە تەرازوی کارو کردەوەکانم گران و قورس بکە، خوایە ئیمانم بەرپاو خۆ ڕاگر بکە، پلەو پایەم بەرز بکەوە، نوێژەکانم وەربگرە، لە هەڵەو تاوانەکانم خۆشبە، خوایە لەبەهەشتدا داوای پلەو پایەی هەرە بەرزت لێ دەکەم، خوایە داوای کلیلەکانی خێرو، کۆتاییەکانیو گشتگیرییەکانیو، یەکەمینو دیارو نادیارییەکەیت لێ دەکەم، خوایە لەبەهەشتدا داوای پلەو پایەی هەرە بەرزت لێ دەکەم، لە بەهەشتدا، خوایە دوعاکانم قەبول بکە، خوایە داوای چاکترین شتت لێ دەکەم لەوەی پێم دەدەی، لەوەی دەیکەم، لەوەی دیارەو لەوەی نادیارە، داوای پلەو پایەی

---

(١) أخرجه الحاكم عن أم سلمة مرفوعاً وصححه ووافقه الذهبي ١/ ٥٢٠ .

هەرەبەرزت لێ دەکەم لەبەهەشتدا، خوایە دوعاکانم گیرا بکە، خوایە داوات لێ دەکەم کە زیکرو باسی من بەرز بکەییەوەو وەری بگری، باری قورسم لەسەر لاببە، خوایە کارو بارم چاك و ساز بکە، دڵ و دەروونم پاك بکەوە، داوێنم بپارێزە، دڵ و دەروونم ڕووناك بکەوە، لە گوناهەکانم خۆشبە، خوایە داوای پلەو پایەی هەرە بەرزی بەهەشتت لێ دەکەم، خوایە قەبولی بکە، خوایە بەرەکەت بخە دڵ و دەروونم و، گوێ و بیستنم و، چاو و دیتنم و، خوایە بەرەکەت بخە گیانم و دروستکردنم و، کردارو ڕەوشتم و، خاوخێزانم، خوایە بەرەکەت بخە ژیان و مردنم و، کاروکردەوەم، خوایە خێرو چاکەکانم گیرا بکە، داوای پلەو پایەی بەرزو بەرێزت لێ دەکەم لە بەهەشتدا، خوایە دوعاکانم قەبول بکە.

١٠٧- ﴿اَللّٰهُمَّ جَنِّبْنِي مُنْكَرَاتِ الأَخْلَاقِ، وَالأَهْوَاءِ، وَالأَعْمَالِ، وَالأَدْوَاءِ﴾[١].

**واتە** : خوایە لە ناکارو ڕەوشتە خراپ و بەدەکانم دووربخەوە،

---

(١) أخرجه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم ووافقه الذهبي ١/٥٣٢ .

**خوایه لەهەواو ئارەزوو کـردارو کـردەوەی بـەدو دەردو بـەڵای خراپم دووربخەوە.**

١٠٨- ﴿أَللَّهُمَّ قَنِّعْنِي بِمَا رَزَقْتَنِي، وَبَارِكْ لِي فِيهِ، وَاخْلُفْ عَلَيَّ كُلَّ غَائِبَةٍ لِي بِخَيْرٍ﴾ [١].

**واتە : خوایە بەوەم ڕازی بکە کە پێم دەبەخشی، وە بەرەکەتم بۆ تیا بخە، خوایە شتێك نادیارەو بۆم نەهاتووە، یا لـێم دەڕوا بە باشترم جێ بۆپێ بگرەوە.**

١٠٩- ﴿أَللَّهُمَّ حَاسِبْنِي حِسَاباً يَسِيراً﴾ [٢].

---

(١) اخرجه الحاكم وصححه ووافقه الذهبـي ١/٥١٠ عن ابن عباس .

(٢) عائیـشە دەڵـێ: کاتێـك کـابرا ڕۆیـشت گـوتم ئـەی پێغەمبـەری خـوا- لێپرسینەوەی ئاسان چییە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کەســەیری نامــەی کردەوەکـانی بکرێو چاوی لێبپۆشرێ، بەڵام ئەی عائیشە هەرکەسـێك لـەم ڕۆژەدا لـەکاتی لێپرسـینەوەدا موناقەشەی لەگەڵدا بکرێ ئـەوا ماڵـێ وێـران دەبـێ، هـەروەها ئیماندار لەدونیادا تووشی هەرناخۆشییەك ببێ خوای گەورە بەهۆیەوە گونـاهی ڕەش دەکاتەوە هەتا ئەگەر درکێکیش بـچێ بەلەشـییەوە). رواه أحمد ٦/٤٨) والحاكم وقال صحيح على شرط مسلم ووافقه الذهبي ١/٢٥٥ =

**واته** : خوایه حیساب و لێپرسینەوەیەکی زۆر سادەو ئاسانم لەگەڵدا بکە.

١١٠- ﴿اللَّهُمَّ أعِنَّا عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ﴾[1].

**واته** : خوایه هاوکاریمان بکە لەسەر زیکر کردنی خۆت، لەسەر سوپاس کردنی خۆت، لەسەر جوانترین شێوازی عیبادەتی خۆت.

١١١- ﴿اللَّهُمَّ إنِّي أسْألُكَ إيمَاناً لاَ يَرْتَدُّ، وَنَعِيماً لاَ يَنْفَدُ،

---

=(عائیشە دەڵێ: کاتێك کابرا رۆیشت گوتم ئەی پێغەمبەری خوا- لێپرسینەوەی ئاسان چییە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کەسەیری نامەی کردەوەکانی بکرێ و چاوی لێبپۆشرێ، بەڵام ئەی عائیشە هەرکەسێك لەم رۆژەدا لەکاتی لێپرسینەوەدا موناقەشەی لەگەڵدا بکرێ ئەوا ماڵی وێران دەبێ، هەروەها ئیماندار لەدونیادا تووشی هەرناخۆشییەك ببێ خوای گەورە بەهۆیەوە گوناهی رەش دەکاتەوە هەتا ئەگەر درکێکیش بچێ بەلەشییەوە).

(١)( پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری (معاذ)ی کرد کە لەدوای هەموو نوێژێك ئەمەبڵێ الحاكم ٤٩٩/١ وصححه ووافقه الذهبي وهو كما قالا وهو عند أبي داود ، ٨٦/٢ والنسائي في السهو ٥٣/٣ .

وَمُرافَقَةَ مُحَمَّد ﷺ فِي أَعْلَى جَنَّة الْخُلْدْ﴾ [1].

**واتــه** : خوایــه داوای ئیمانێکــت لێده‌کــه‌م هــه‌رگیز هه‌ڵناگه‌ڕێته‌وه، داوای نیعمــه‌تێکت لێ ده‌کـه‌م قـه‌ت لـه‌ناو ناچێ و کۆتـایی پـێ نـایێ ، داوای هاوڕێیــه‌تی موحه‌ممــه‌د پێغه‌مبه‌رت ﷺ، له‌بــه‌رزترین شـوێن له‌به‌هه‌شـتی نــه‌بڕاوه لێده‌کەم.

١١٢- ﴿اللَّهُمَّ قِنِي شَرَّنَفْسِي، وَاعْزِمْ لِي عَلَى أَرْشَــد أَمْــرِي، اللهمَّ اغْفِرْ لِي مَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَخْطَــأْتُ، وَمَــا عَمَدْتُ وَمَا عَلِمْتُ، وَمَا جَهِلْتُ﴾ [2].

**واته** : خوایه له‌زه‌ره‌رو زیان و شه‌ڕوشۆڕی خۆم بــه‌دورر کــه‌و بمپارێزه، خوایه خۆڕاگیرو جێگریم بکــه له‌ســه‌ر ئه‌نجامــدانی ڕاسترینی کاروباره‌کانم، خوایه له‌وه‌م خۆشبه شـاردومه‌ته‌وه‌و

---

( ١) اخرجه ابن حبان (موارد) ص ٦٠٤ برقم ٢٤٣٦ عن ابن مسعود موقوفاً ، ورواه أحمد من طريق آخر ٣٨٦/١ ، ٤٠٠ والنسائي في عمل اليوم والليلة رقم ٨٦٩ .

(٢) الحاكم ٥١٠/١ وصححه ووافقه الذهبي وأخرجه أحمد ٤٤٤/٤ وقال الحافظ في الإصابة : إسناده صحيح .

نهێنیه، لەوەم خۆشبە ئاشکراو دیارە، لەوەم خۆشبە بەهەڵە کردوومە، یا بەئەنقەست کردوومە، لەوەم خۆشبە زانیومە و بەزانایی کردومە، یا بە جەهل و نەزانی کردوومە.

١١٣- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُبِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الْعَدُوِّ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ﴾[1].

**واتە** : خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لە زاڵ بوون و کەلەکەبوونی قەردو، لەسەرکەوتن و زاڵ بوونی دوژمن، لەگردبوونەوەو یەکبوون و گەلە کۆمەکردنی دوژمنان.

١١٤- ﴿اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي، وَعَافِنِي، أَعُوذُ بِكَ بِاللهِ مِنْ ضِيقِ الْمُقَامِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ [2].

**واتە** : خوایە لێم خۆشبە، ڕێنماییم بکە، ڕزق و ڕۆژی و بژێوم پێ ببەخشە، ساغ و عەفوم بکە، خۆم بەخوا دەپارێزم لە تەنگی جێگاو پایە لە ڕۆژی دواییدا.

١١٥- ﴿اللَّهُمَّ مَتِّعْنِي بِسَمْعِي، وَبَصَرِي، وَاجْعَلْهُمَا الْوَارِثَ

---

[1] اخرجه النسائي ٨/٢٦٥ وانظر، صحيح النسائي ٣/١١١٣ .

(٢) النسائي ٣/٢٠٩ وابن ماجه ١/٤٣١ وغيرهما وانظر، صحيح سنن النسائي ١/٣٥٦ وصحيح ابن ماجه ١/٢٢٦ .

مِنِّي، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ يَظْلِمُنِي، وَخُذْ مِنْهُ بِثَأْرِي﴾ [1].

**<u>واته</u> : خوایه بەبیستن و بە بینینم (بەگوێ و بەچاوم) بەهرەمەندم بکەو، تام و چێژو کەلکم پێ بگێنە، خوایه هەمیشه چاو و گوێ (بینین و بیستن) لەمندا بیانکه میرات لێگر، واته هەمیشه ساغ و سەلامەت بن بۆ من و وەچاوەکانیشم، خوایه بەسەرئەودا سەرمخە کە ستەمم لێ دەکا، خوایه بەهۆی تۆڵەی من تۆڵەی لێ بکەوەو هەقی لێ وەرگرەوە.**

١١٦- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِيشَةً نَقِيَّةً، وَمِيْتَةً سَوِيَّةً، وَمَرَدًّا غَيْرَ مُخْزٍ وَلاَ فَاضِحٍ﴾ [2].

**<u>واته</u> : خوایه داوای ژیان و بژێویەکی پاك و حەلاڵ و، مردنێکی ڕێك و خۆش و ئاسانت لێ دەکەم، داوات لێ دەکەم بەبێ ریسوایی و سەرشۆڕی و خەجالەتباری و ئابڕوچوون**

---

(١) اخرجه الترمذي ، وانظر، صحيح الترمذي ١٨٨/٣ وأخرجه الحاكم وصححه ووافقه ٥٢٣/١ .

(٢) زوائد مسند البزار ٤٤٢/٢ برقم ٢١٧٧، والطبراني وانظر، مجمع الزوائد ١٧٩/١٠ قال : إسناد الطبراني جيد . . . . .

بگەڕێمەوە لات و بمرم.

١١٧- ﴿اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كُلُّهُ، اللهمَّ لاَ قَابضَ لمَا بَسَطْتَ، وَلاَ باَسط لمَا قَبَضْتَ، وَلاَ هَاديَ لمَنْ أَضْلَلْتُ وَلاَ مُضلَّ لمَنْ هَدَيْتَ، وَلاَ مُعْطيَ لمَا مَنَعْتَ وَلاَ مَانعَ لمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُقَرِّبَ لمَا بَاعَدْتَ، وَلاَ مُبَاعدَ لمَا قَرَّبْتَ اللهمَّ ابْسُطْ عَلَيْنَا منْ بَرَكَاتكَ وَرَحْمَتكَ وَفَضْلكَ وَرزْقكَ، اللهمَّ إنِّي أَسْأَلُكَ النَّعيمَ الْمُقيمَ الَّذي لاَيَحُولُ وَلاَ يَزُولُ، اللَّهُمَّ إنِّي أَسْأَلُكَ النَّعيمَ يَوْمَ الْعَيْلَة، وَالأَمْنَ يَوْمَ الْخَوْف، اللهمَّ إنِّي عَائذٌ بكَ منْ شَرِّ مَا أَعْطَيْتَنَا وَشَرِّ مَا مَنَعْتَنَا، اللهمَّ حَبِّبْ إلَيْنَا الإيمَانَ وَزَيِّنْهُ في قُلُوبنَا وَكَرِّهْ إلَيْنَا الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعصْيَانَ وَاجْعَلْنَا منَ الرَّشدينَ، اللهمَّ تَوَفَّنَا مُسْلمينَ، وَأَحْينَا مُسْلمينَ، وَأَلْحقْنَا بالصَّالحينَ غَيْرَ خَزَايَا وَلاَ مَفْتُونينَ، اللهمَّ قَاتل الْكَفَرَةَ الَّذينَ يُكذِّبُونَ رُسُلَكَ وَيَصدُّونَ عَنْ سَبيلكَ ـــ وَاجْعَلْ عَلَيْهمْ رجْزَكَ وَعَذَابَكَ، اللهمَّ قَاتلَ الْكَفَرَةَ الَّذينَ أُوتُوا الْكتَابَ، إلَهَ الْحَقِّ (آمينْ)﴾ [(١)].

---

(١) أحمد بلفظه ٣/٤٢٤ وما بين المعكوفين للحاكم ١/٥٠٧ ، ٣/٢٣-٢٤، وأخرجه البخاري في الأدب المفرد برقم ٦٩٩ وصححه الألباني في تخريج فقه السيرة ص ٢٨٤ وفي صحيح الادب المفرد للبخاري برقم ٥٣٨ ص ٢٥٩ .

**واتە** : خوایە هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ تۆ، لەسەر هەموو شتێك سوپاس و ستایش بۆ تۆ، خوایە هیچ کەسێك ناتوانی دەستی ئەو کەسە بگری کەتۆ دەستی دەگری و دەستی بەرەکەتی بۆ درێژ دەکەی، کەسیش ناتوانێ دەستی ئەو کەسە بگری و هاوکاری بکا کەتۆ مەنعی دەکەی و لێی دەگریەوە، هیچ ڕێنمایی کەرێك نیە بۆ ئەو کەسەی تۆ گومڕاو سەرگەردانی دەکەی، وە هیچ گومراکەرێکیش نیە بۆ ئەو کەسەی تۆ ڕاستە ڕێ و ڕێنمایی دەکەی، هیچ کەسێك ناتوانێ بەو کەسە ببەخشێ تۆ پێی نابەخشی و لێی دەگریەوە، کەسیش ناتوانێ ببێتە ڕێگر لە پێش ئەو کەسەی کە تۆ لێی دەگریەوە، وە کەسیش ناتوانێ ببێتە ڕێگر لەپێش ئەو کەسەی کە تۆ پێی دەبەخشی، وە ئەو کەسەی کەتۆ دوری دەخەیتەوە کەس ناتوانێ نزیکی بخاتەوە، ئەو کەسەش کە تۆ نزیکی دەخەیتەوە کەس ناتوانێ دوری بخاتەوەو نەفی بکا، خوایە لە فەڕو بەرەکات و لە ڕەحمەت و لە فەزڵ و بەخشش و لە ڕزق و ڕۆزی و بژێوی خۆت بەسەرماندا ببارێنەو، فراوان بکە، خوایە داوای نازو

نیعمەتێکت لێ دەکەم کە هەمیشە بەرپاو جێگیرەو ناگۆڕێ و لاناچێ، خوایە لە ڕۆژی تەنگانەو هەژاری و دەست کورتی داوای نازو نیعمەت و بژێویت لێ دەکەم، لەڕۆژی ترس و تەنگانە داوای ئەمن و ئاسایش و سەلامەتیت لێ دەکەم، خوایە بەتۆ خۆم لە زەرەرو زیان و خراپەو شەڕوشۆڕی ئەوە دەپارێزم کە پێمان دەدەی، لەوەیش کە پێمان نادەیت و لێمانی دەگریەوە، خوایە بیرو باوەڕمان لەلا خۆشەویست بکە و، لە دڵ و دەروونماندا جوانی بکەی و بیڕازێنەوە، وە کوفرو بێ باوەڕی و دەرچوون و خراپەکاری و گوناه و تاوان و یاخی بونمان لەلا بیێزێنە، خوایە لەسەر ڕێی ڕاست و ڕاستە ڕێمان بکە، خوایە بە موسڵمانێتی بمان مرێنە، خوایە بە موسڵمانێتی بمان ژیێنە، خوایە بەو چاکە کارانەمان بگەێنە کە سەر شۆڕو بەلادارو سەر بەفیتنەو ئاژاوە نین، لەڕێگای تۆدا دەبنە بەربەرچ و ڕێگر، خوایە سزاو خەشمی خۆتیان بەسەردا بڕێژە، خوایە ئەو کافرانە بکوژەو لەناو ببە کە پەیام و پەرتووکی تۆیان بۆ هات، کەچی هەر ئیمانیان نەهێناو پشتیان تێ کردو بێ باوەڕ بوون، ئەی خواو

پەرستراوی بەهەق دە وایان لێ بکەو دوعاکانمان لێ گیرا بکەو وەلأمان بدەوەو دوعاکانمان جێ بەجێ بکە.

١١٨- ﴿أَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاهْدِنِي، وَعَافِنِي، وَارْزُقْنِي﴾ (١).

﴿.... وَاجْبُرْنِي وَارْفَعْنِي﴾ (٢).

**واتە** : خوایە لێم خۆشبەو ڕەحم پێ بکەو، ڕاستە ڕێم بکەو ساغ و عەفوم بکەو ڕزق و ڕۆزیم پێ بدە.

...... خوایە چاکم بکەوەو زاڵم بکەو، بەرزو بەڕێزم بکە.

١١٩- ﴿أَللَّهُمَّ زِدْنَا وَلاَ تَنْقُصْنَا، وَأَكْرِمْنَا وَلاَ تُهِنَّا، وَأَعْطِنَا وَلاَ تَحْرِمْنَا، وَآثِرْنَا وَلاَ تُؤْثِرْ عَلَيْنَا، وَأَرْضِنَا وَارْضَ عَنَّا﴾ (٣).

---

(١) لەڕوایەتێکی موسلیم ئەم دوعایە خێرو چاکەی دونیاو قیامەت بۆ کۆدەکاتەوە، لەسونەنی ئەبو داود هاتووە، کاتێک ئەعرابیەکە ڕۆیشت، پێغەمبەر فەرمووی: دەستەکانی پڕ کرد لەخێر. مسلم٤/٢٠٧٢- ٢٠٧٣/ ٢٠٧٨/٤.

(٢) انظر، : صحيح ابن ماجه ١٤٨/١ ، وصحيح الرمذي ١/ ٩٠ .

(٣) الترمذي ٣٢٦/٥ برقم ٣١٧٣ ، والحاكم ٩٨/٢ وصححه ، وحسنه الشيخ عبدالقادر الأرنازوط في تحقيقه لجامع الأصول ٢٨٢/١١ برقم ٨٨٤٧ .

واتە : خوایە لێمان زیاد کە لێمان کەم مەکە، خوایە بەرێزو پایەدارمان بکە سووك و ریسوامان مەکە، خوایە پێمان ببەخشەو بێ بەشمان مەکە، خوایە بەرزمان بکەوەو، کەسمان بەسەردا بەرز مەکەمەوە، خوایە ڕازیمان بکەو لێمان ڕازی بە.

١٢٠- ﴿اللهمَّ أَحْسَنْتَ خَلْقِي فَأَحْسِنْ خُلُقِي﴾ (١).

واتە : خوایە منت جوان درووست کردووە، کردارو ڕەوشتیشم جوان بکە.

١٢١- ﴿اللُّهُمَّ ثَبِّتْنِي وَاجْعَلْنِي هَادِياً مَهْدِيّاً﴾ (٢).

واتە : خوایە خۆڕاگرو جێگیرم بکە، خوایە بمکە ڕێنمایی کەرێکی ڕێنما کار.

١٢٢- ﴿اللُّهُمَّ آتِنِي الْحِكْمَةَ الَّتِي مَنْ أُوتِيَهَا فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً

---

(١) أخرجه أحمد ٦٨/٦ ، ١٥٥ ، ٤٠٣/١ وصححه الألباني في إرواء الغليل ١٥٥/١ برقم ٧٤ .

(٢) دل عليه دعاء النبي ﷺ لجرير (رضي الله عنه) انظر، البخاري مع الفتح ١٦١/٦ .

كَثيراً﴾ (١).

**<u>واتە</u> : خوایە حیکمەت و دانایی و لێزانیەکم پێ بدە ئـەوەی پێتداوە بەڕاستی خێرو چـاکەیەکی زۆرت پێـداوەو لەگەڵـدا کردووە.**

---

(١) قال سبحانه وتعالى ﴿يُؤتي الحِكْمَةَ مَن يَشاءُ وَمَن يُؤْتَ الحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثيراً﴾(البقرة : ٢٦٩) . ( خـوای گـەورە کێـی بیـەوێ و شایـستەبێ حیکمـەت و دانـایی پـێ دەبەخـشێ و هـەر کەسـێکیش حیکمـەتی پـێ ببەخشرێت، ئەوە بێگومان خێرێکی زۆری پێدراوە).

## پێرست

***لە کۆتاییدا خوایە درودو سەلام برژێنە بەسەر موحەممەدی پێغەمبەرمان ﷺ و بەسەر خاو خێزان و یاوەرانی و شوێن کەوتوانی بەچاکە تا ڕۆژی دوایی.***




کتێب باشترین هاوڕێیە...؟

قال: رسولله ﷺ

اَلا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيرِ اَعْمالِكُمْ، وَاَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجاتِكُمْ، وَخَيرٍ لَكُمْ مِنْ إِنْفاقِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، وَخَيرٍ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ ؟
قَالُوا بَلَى قَالَ : ذِكْرُ اللهِ تَعَالَى

واته : ئایا هەواڵتان پێ بدەم دەربارەی چاکترین و پاك ترینی کردەوەکانتان، لەلایەن پاشای خۆتان کە خوای گەورەیە، بەرزترین کارو کردەوەن کە لەپلەو پایەکانی ئێوە، بۆ ئێوە زۆر باشترن لە بەخشینی پارەو پول و زێرو زیو، بۆ ئێوە زۆر لەوە باشترە کە بە دوژمنانتان بگەن، ئەوسا ئێوە لەگەردەنی ئەوان بدەن و ئەوانیش لەگەردەنی ئێوە بدەن و یەکتر بکوژن؟، گوتیان بەڵێ، ئەویش فەرمووی : ئەو کارو کردەوانە زیکرو یادی خوایە

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٢٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر